# فهرس

# سەرەتا

جەنگ دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە و لە پێش هاتن و دروستبونی مرۆڤەوە بونی هەبوە ، وە ئەم دیاردەیە لەگەڵ ئەوەی دیاردەیەكی سامناكو هۆكاری ڕشتنی خوێنی مرۆڤەكانە ، لە هەمان كاتدا لە ڕویەكیترەوە لابەری ئەو ژەنگەیە كە زەمەنێك ڕوی زەمین پیسئەكات(فلولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لفسدة الارض)

(وانزلنا الحديد فيه بئس شديد ومنافع للناس) هەمیشە هێزی شەڕ بونی هەبووە وە ئەبێت لەگەڵ هێزی خێر وە لەنێوان ئەم دوانەشدا بەردەوام ئەم جەنگە دروست ئەبێ كە ئیستە باسی جۆرەكانی ئەكەین وە هەروەها لە بەشێكی گرنگیدا ورد ئەبێنەوە كەئەویش بریتیە لە نەخشەو پلانی جەنگ وە بەتێرو تەسەلی باسی هەندێك لە بابەتە تكتیكیەكانی ئەكەین لەبەر گرنگیان و بەسەر هەندێك بابەتیتر بەخێرای تێئەپەڕین كە زیاتر لاوەكین وە ئەی خوێنەر ئەم پەرتوكە بۆ ئەوە نەنوسراوە تا سودی لێوەربگریت بۆ ڕوبەڕو بونەوەی حــــــەق بەڵكو بۆ ئەوە نوسراوە كە هێزێكبێت بۆ پاڵپشتی حەق.

ئـــــ ڕەكان

# (جــــۆرەكانــــــــــى جــــەنگـ)

## جـــەنگ لەڕوی ڕێك خستنەوە:

- ❖ جەنگی ڕێکخراو:
- ❖ جەنگی نارێکخراو(پارتی زانی):
- ❖ جەنگی گورگە تەنیاکان:

## جـــەنگ لەڕوی جێگەوە:

- ❖ جەنگی شارو و ناوچەی دانیشتوان:
- ❖ جەنگی ناوچە سەختەکان(چیا و دارستان):
- ❖ جەنگی ناوچە تەختەکان(بیابان و خاکی کشتوکاڵی):

## جـــەنگ لەڕوی ستراتیژیەتەوە:

- ❖ جەنگی سـارد:
- ❖ جەنگی گەرم:
- ❖ جەنگی ئەتۆمی:
- ❖ جەنگ بە وەکالەت:
- ❖ جەنگی بەفێرۆدان:



## جەنگ لەڕوی ئامانجەوە:

- جەنگی ئابوری:
- جەنگی کێ بەرکێ:
- جەنگی پڕ تاودان:
- جەنگی دەرونی:
- جەنگی دەرسدادان:
- جەنگی تەکتیکی:

## جەنگ لەڕوی لایەنداریەوە:

- جەنگی جیهانی:
- جەنگی ئیقلیمی:
- جەنگی ناوخۆ:
- جەنگی تایفە گەری:

### ئامانجەکانی جەنگ:

لە پشت هەمو جەنگێ ئامانجێك یان چەند ئامانجێك هەیە جا لەکۆندا ئامانجەکان لاوەکیترو بچوکتربوون وەك(ئافرەت-دەرخستنی هێز-ڕقێکی منداڵی-وەعد یان حەزی پاشایەك-سەپاندنی مەزهەب یان دینێك.......هتد) بەڵام لە ئیستاداو دوای بەرەوپێشچونی تەکنەلۆژیا و بچوك بونەوەی زەویو زۆربونی پێداویستیەکانی مرۆڤ ئامانجەکانی جەنگ تەواو گۆڕاون زۆربەی کات ئامانج بریتیە لە کۆکردنەوەی داهات وە لە گرنگترین ئەو داهاتانە (نەوت و غازو و سامانی سروشتی و ژێر زەوی و.........هتد) وە هەروەها ڕێگە بازرگانیەکان و کەناڵە دەریاییەکان و مەمەڕەکانی تێپڕبونی زەمینیو ئاسمانی و دەریایی ئەمانەش لە پێناو دابینکردنی پێویستیەکانی کۆمەڵێکە لەسەر حسابی کۆمەڵێکیتر.

**دەستەواژەی سەرکەوتن لەجەنگ:**-واتە تێکشکاندنی هێزی سەربازی دوژمن و پەرتەوازەکردنی وە نەهێشتنی هەرشتێك بەناوی بەرگریەوە و ملکەچکردنی بە تەواوی مانا.

## پایـــــەکانــی جەنگ:

1. **ئامانجێکی ڕون:** هەرجەنگێك بەبێ ئامانج دەستپێبکات یان ئامانجێکی نادیاری هەبێت ئەوا چارەنوسێکی نادیار چاوەڕێی دەسپێکەر ئەکات.
2. **بونی هێزێکی سەربازی:** جەنگ کاری دەست سپیەکان و گوڵمە ئاڵەکان نیە بەڵکو پێویستی بە پیاوی بەهێزە کە ئارامبگرێت لەسەر ئاستەنگیەکان.
3. **بونی بیرو باوەڕێکی جەنگی(العقیدة القتالیة):** پێویستە هۆکارێك هەبێت تاکو سەربازان ژیانی خۆیانی لەپێناو بخەنە مەترسیەوە چونکە جەنگ یاریە بە ڕوح.
4. **بونی پێویستیەکانی جەنگ:** چەك و پێداویستیە سەرەتاییەکانی شەڕکردن بەلای کەمەوە.
5. **بونی سەرچاوەیەك یان چەند سەرچاوەیەکی دارایی:** دارای و ژێرخانی ئابوری وزەی جەنگە بەبێ ئابوری ئاستەمە جەنگ بەردەوامبێت.
6. **ڕاگەیاندن:** ئەمیش بە دەماری جەنگ ناودەبرێت وە لەگرنگترین پایەکانی جەنگە وە هەر لەم ڕێگەیەشەوە زیاتر ئەتوانرێت جەنگی دەرونی لە دژی دوژمن ئەنجام بدرێت.
7. **نەخشەیەکی دروست(پلان):** نەخشە دیاری ئەکات جەنگ لەو کاتەی دەست پێئەکات تائەوکاتەی تەواو تەواو ئەبێت چی تێئەچێت وە چۆن ئەبێت وەچی تیابەکاردێت.

# جەنگی ڕێکخراو

لەنێوان دوهێزی ڕێکخراودا ئەبێت کە خاوەنی سوپای سەربازی گەورەو ڕێکخراوبن وە ئەشێت هێزەکان هاوپەیمانیبن لە زۆربەی کاتدا.

## پێکهاتەی سوپای ڕێکخراو:

1. گروپ: لە 10-20 سەرباز پێکدێت.
2. یەکینە: لە 2-5 گروپ پێکدێت.
3. سریە:لە3-5 یەکینە پێکدێت
4. کەتیبە: لە 3-6 سریە پێکدێت.
5. تیم(فرقة): لە 4- 5 کەتیبە پێکدێت.
6. لیوا: لە5-6 تیم پێکدێت.
7. فەیلەق: 6-7 لیوا.
8. سوپا :لە 5-8 فەیلەق.

*ئەمەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکیتر ئەگۆڕێت

*لەم جۆرە جەنگەدا دەوڵەتو هێزەکان تەواوی هێزی ئابوریو ستراتیژیو تواناکانی دەوڵەت ئەخەنە گەڕ بۆ بەدەستهێنانو قۆستنەوەی ئامانجی جەنگ و سەرکەوتن تیایدا.

***سەرکەوتن** بەمانای بردنەوە نایات لە شەڕەکاندا بەڵکو ڕەنگە هێزێك تەواوی پێکدادانەکان بباتەوە بەڵام لەکۆتایدا هەمو تواناو هێزی لەدەستبداو وڵاتەکەشی بەرەو ڕوخان ببات (لەدەستدانی ڕوبەڕوبونەوە مانای لەدەستدانی جەنگ نیە)

**نمونەی جەنگی ڕێکخراو:**جەنگی جیهانی یەکەم و جەنگی جیهانی دووەم کە بەتەواوی مانا جەنگی ڕێکخراوبوون، وەهەروەها جەنگەکانی سەردەمی کۆن بەهەمانشێوە جەنگی ڕێکخراوبون جگە هەندێکی کەمیان نەبێت بەشێوازێکی جیاواز ئەنجامدراوە.

## رێگەکانی جێبەجێهێنانی جەنگی رێکخراو لەسەر ئاستی کارکردن:

1. **جەنگی گشتگیر:** ئەو جەنگەیە کە تەواوی تواناو وزەی تیا بەکاردەهێنرێت لە هاوپەیمانیکردن و شوێنکەوتن و هەمو جۆرە چەکێکی کلاسیکیو پێشکەوتو لەسەر رووبەرێکی جوگرافی کە هەمو خاکی دوژمن ئەگرێتەوە یان زوربەی خاکەکەی ، بە مەبەستی دانانی نەخشەیەکی نوێ بۆ خاکی دوژمن و واقی بارودۆخی ، لە رێگەی خۆ بەدەستەوەدانیەوە یان هاتنەناو رێکەوتنی بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە ستراتیژیەکانت.
2. **جەنگی سنوردار:** تیایدا چەند کەتیبەیەکی سەربازی بەکاردێت لەگەڵ چەند جۆرێك لەچەکەکان بەپێی پێویست بەبێ جوڵاندنی زیاتر لە 50٪ ی هێزی سەربازی وە ئامانجـــی ئەم جەنگەش لەناوبردنی هێزێك یان وزەیەکی دوژمن و پاشان پاشەکشەکردن ، وەزیاتر ئەم جۆرە لە جەنگ بەکاردێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانێکی سیاسی سنوردار.

*جەنگی رێکخراو بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە سوپاو ئابوری ئەبەستێت وە پاشان نەخشەیەکی دروست و رێك بەڵام ئابوری بناغەیەتی.

*ستراتیژیەتی جەنگی رێکخراو بناغەکەی بریتیە لە(برینەوە و تێکشکاندن- بەرپەچدانەوەی هەرشتێکی پێشبینی کراو پێشبینی نەکراو)

## جەنگی پـــــارتیزانی

جۆرێکە لەجۆرەکانی جەنگ تیایدا هێزێکی لاواز ڕوبەڕوی هێزێکی بەهێز ئەبێتەوە وە ڕێکخراوەی پارتی زانان بریتیە لە کۆمەڵێك کەس کە بنەمایەکی کۆمەڵایەتی یان ئاینی یان نەتەوەی کۆیانی کردۆتەوە وە لەزۆربەی کاتدا جەنگێکە لەسەر حەقێکی زەوتکراو کەتیایدا نەیانتوانیوە بەڕێگە ئاشتیەکان وەریبگرن ، وە ئەم جەنگە **ڕۆبەرت تابەر** بەجەنگی ستەمدیدەکان ناساندویەتی**(حرب المستضعفین)**

## پایـــەکانی جەنگی پارتیـــزانی:-

1. **ئامانج**: ئامانجی جەنگی پارتیزانی لە زۆربەی کاتدا دەرکردن یان لەناوبردنی دەسەڵاتێکی ستەمکارە.
2. **ڕاکێشانی سۆزی خەڵکی سیڤیل**: خەڵکی سیڤل سەرچاوەی پشتگیری پارتی زانان ماوتسی تۆنگ ئەڵێت**(خەڵکی سیڤیڵ بۆ پارتی زانان وەکو ئاووان بۆ ماسی)**.
3. **خێرای و غافڵگیری**:
4. **فێڵ**:بریتیە لە کردنی کارێك بەجۆرێك دوژمن بخاتە داو.
5. **پەیوەندی**: پێویستە پەیوەندیەکی بەردەوام لەنێوان تاکەکان و سەرکردایەتیا هەبێت.
6. **چەك و عەتاد**: لەهەمو جەنگەکان چەك بەشێکی سەرەکیە.
7. **ئاسایشی گشتی**: پێویستە ناوچەکانی تایبەت بە سەربازان ئاسایشبێت بەتایبەت لە هەنگاوی دووهەمی جەنگی پارتی زانیدا بەتایبەتیتر ناوچەکانی هێڵی پشتەوە.
8. **بونی توانای پاشەکشە کردن**: پێش دیاری کردنی هێڵی هێرشبردن پێویستە هێڵی پاسەکشە دیاریبکرێت.
9. **بەفیڕۆدانی توانای دوژمن**:جەنگی پارتیزانی درێژە وە ئەتوانرێت سود لە درێژیەکەی وەربگیرێت بۆ بەفیڕۆدانی هێزی دوژمن.

**قۆناغەکانی جــــەنگی پارتیــــزانی:** جەنگی پارتی زانی ئەکرێت بە سێ قۆناغــی سەرەکیەوە بەڵام لە هەندێك کاتدا چەند هەنگاوێکیتر دروست دەبێت بەپێی شوێن و کات و سروشتی ناوچەی دەرکەوتنی جەنگی پارتیزانی.

### قۆناغە سەرەکیەکان:

❖ **قۆناغی یەکەم(بەفیڕۆدانی توانای دوژمن):-**

**لێیبەوهەڵێ** هاوشێوەی **(کێچوسەگ) تۆپاندن بە هەزاربرینەوە** ماوسیتۆنگ ئەڵێت(**ئەگەردوژمن هێرشیکرد ئەوا پاشەکشە ئەکەین وەگەرهەستی بەئاسایشکرد وپشویدا ئەوا هەڵئەکوتینە سەری وە گەرپاشەکشەی کرد ئەوا هێرشی ئەکەینە سەر**).

پێویستە بەبەردەوامی دوژمن لەژێر چاوەدێری بێت وە لەڕاستیدا ئەمەش کارێکی ئاسانە چونکە سوپای بەرامبەرت ڕێکخراوە وە تۆش نادیار وە شێوازی بەکارهاتو لەم هەنگاوەدا **تێ هەڵکوتان و کمینە** وە هێرشکردن پێویستە بۆسەر خاڵە لاوازەکانی دوژمن و ئەو شوێنانەبێت کە کەمتر توندوتۆڵی پاسەوانی تیادایە وە لەم هەنگاوەدا سیخوڕەکان ترسناکترین کاریگەرین لەسەر پارتیزانان هەیە ، وە ئەم هەنگاوەش پێویستیەکی زۆری بە ئەزمون و چەکو عەتاد نیە ئەوەی لەسەر پارتیزانانە ئەوەیە دورکەونەوە لەهەرشتێك کە ئەبێتە هۆی ئاشکرابونیان وە پێویستە بارو دۆخێکی گونجاو هەبێت بۆ ئەم هەنگاوە.

## خاسێتەکانــــی قۆناغی (بەفیڕۆدان):

1. بونی بنکەو بارەگا لە شوێنە دورە دەستەکان(شاخ-دارستان-شارەکان) وە بەدڵنیاییەوە پێویستە نهێنیبن وە بەتوندی وە کاتی ئاشکرابونیان پێویستە پاشەکشەی تیابکرێت وە ئەو بنکانەی لە چیاو دارستانەکان هەن پێویستە لەڕوی سروشتیەوە توندو تۆڵبێت بەجۆرێك دەستی دوژمنی نەگاتێ.
2. بونی بانگەوازێك بۆ بەسەربازکردنی خۆبەخشان .
3. دروستکردنی پێگەیەك لەناو گەلدا لەڕێگای مامەڵەی باش لەگەڵ خەڵك.

4. دیاری کردنی ئاماجی بەر دەستو دەوڵەمەند بە غەنیمەت بەهەمان شێوە ئەو ئامانجانەی کاردانەوەی پۆزێتیڤیان لەناو کۆمەڵگەدا ئەبێت بۆ نمونە لەناوبردنی ئەو بەرپرسانەی کە گەل خۆشیناوێن یان ستەمیان لەخەڵك کردووە یان تێکدانی ئەو جێگایانەی کە لەگەڵ عادەتو تەقلیدی خەڵکی وڵات ناگونجێت یان هەر کارێکیتر بەوجۆرە.
5. وازهێنان لە بەرگریکردنی ناوچەی لە بەرامبەر بەدەستهێنانی دۆسێی جەنگ پێویستناکات لە جێگەیەکا بمێنیتەوە کە ئەزانی دەرئەکرێی وە خەڵکی سیڤیلت لێ زیز ئەبێت ، بیکە بە یاسای ژیانی جەنگیت( **سیڤیل ئەیەوێت بژی لە بەرامبەرئەوەی گوێرایەڵتبێ)** وە تۆ ئەو ژیانە هێمنەی بۆ دابینکە ئەو کێبەرکێی دەسەلاتت لەگەڵناکات.
6. بونی هۆکاری پەیوەندی لەنێوان پارتیزانان زۆربەی کات ئەو هۆکارە بریتیە لە **(رژێمی کات)** واتە بۆنمونە رۆژی------ لە شوێنی------ کۆئەبینەوە بۆ باسکردنی دۆسیەی------ بەدڵنیاییەوە پێویستە هەمو ئەمانە بەشفرەبێت.
7. پشتبەستن بە تەکنیکەکانی کمین و تێ هەڵکوتان**(الاغارة)** ی خێراو کردەوەی قەنص.
8. بونی حەشارگە بۆ شاردنەوەی چەکو عەتادی سەربازی.
9. خوێندنەوەی دوژمن لەڕوی کۆمەلایەتی و سیاسیو.......هتد بۆ نمونە گەر داگیرکەر بوو ئەوا پێویستە لەڕێگەی گەلەوە کوشتار بکرێت وو گەر ئایدۆلۆجی بوو ئەوا لەڕوی بیرو باوەڕی توندەوە کوشتار ئەکرێت وە گەر سوپای دوژمن سوپای نیشتیمانی وڵات بوو ئەوا پێویستت بە ئۆپۆزسیۆنە ، وە لە سەختترین جۆرەکانی جەنگی پارتی زانی ئەو جەنگەیە کە دژی سوپای نیشتیمانی ئەکرێت بۆیە پێویستی بە وریاییەکی زۆرە.

10 . بونی بەشی دەرونی و ڕاگەیاندن و خۆپیشانداندان وە گەورەکردن و بچوککردنەوەی بابەتەکان**(فیل کردن بەمشك مشککردن بە فیل)** جەنگی ڕاگەیاندنو دەرونی بە تەواوی واتا.

## چۆنێتی کارکردن لە قۆناغی یەکەم:

1. لێدانی دوژمن لە خاڵە لاوازو کەمتەرخەمەکان لەڕوی پاسەوانیو توندوتۆڵیو قەڵابەندیەوە.
2. فێربە چۆن پاشەکشە ئەکەیت(**فێری هونەری هەڵهاتن و خۆدزینەوە ببە**) بزانە لەم جۆرە جەنگەدا ئازایەتی خۆدەرخستن نیە.
3. وا لە دوژمن بکە کە لەڕوی توڕەبونەوە مامەڵە بکات وە داناى لەبیر بکات.
4. لێنەدانی دوژمن لە پێشەوەو ڕوبەڕوو بەڵکو لە پشتەوەو لە هێڵەکانی یارمەتی و لۆجستی و لە لایەکانەوەو بگەڕێ بەدوای لاوازترین خاڵدا.
5. بڵاوکردنەوەی دوژمن لە فراوانترین ناوچەدا چەندێ توانا هەبوو بۆ نمونە 4 کردەوە لە 4 ناوچەی جیاواز باشترە لە 8 کردەوە لە یەك ناوچەدا.
6. لەم قۆناغەدا بڵاوکردنەوەی دوژمن لە کوشتنی باشترە نەهێشتنی ئاسایشی بۆ دوژمن باشترە لە داگیرکردنی ناوچە.
7. هەوڵدان بۆ گواستنەوەی کردەوەکان بۆ ئەو ناوچانەی کە دوژمن تێیدا پشتگیری مەدەنی هەیە جا پشتگیری ئایدۆلۆجی دینی مەزهەبی وە دورخستنەوە یان کەمکردنەوەی کردەوەکان لەو ناوچانەی پشتیوانی پارتی زانانی تیایە ، ناوچەکان ئەکرێن بە سێ بەشەوە سێ ڕەنگ سپـــی ڕەش ســـــەوز ، سپی هەمو ئەو ناوچانە ئەگرێتەوە کە پشتگیری پارتی زانان تیادایە ئەمەش ناودەبرێ بە سەرچاوەی پشتیوانی لە هەنگاوی دووهەم ، ناوچەی ڕەش ئەمەش ناوچەکانی پشتگیری ڕژێمە یان هاوپەیمان و هاو ئایدۆ لۆجیە لەگەڵیدا ، ناوچەی ســـەوز ناوچە بێ لایەنەکانن وە دورنیە گەر بواریان بۆ بڕەخسێ پشتی بەهێز بگرن یان ئەوەی سودی زیاتر بۆیان ئەبێت یان واز لە هەردوو لایەنەکە بهێنن تا تەواو ئەڕوخێن و لە کۆتایدا مێزەکە بەسەر هەردوکیان هەڵبگێڕێتەوە و ببێتە خاوەنی دۆسەکەو دەست بەسەر وڵات بگرێت بۆیە پێویستە بە وریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵبکرێت.
8. لەکۆتای ئەم قۆناغەدا زۆربەی کات دوژمن ناچار دەبێت بە کۆکردنەوەی هێزەکانی لەپێناو پاراستنی هێزو واز لە هەندیك لە خاکەکەی ژێر دەسەلاتی

ئەهێنێت ، پێویستە بەخێرای هەنگاو نەنرێت بەرەو قۆناغی داهاتو وە ئارامی جوڵەکردن بپارێزرێت تائەوکاتەی دڵنیائەبیت لە گونجاوی بارودۆخەکە.

*درێژترین قۆناغ بریتیە لەقۆناغی یەکەم وەکورتترین قۆناغ پێویستە قۆناغی سێهەنبێت.

لەم قۆناغە گەر بێتو دوژمن دەستبگریت بەسەر هەمو وڵاتدا ئەوا پێویستە هێزەکەی بڵاوبکاتەوە بەمەش لاواز ئەبێت ، وەگەر بیەوێت خۆی بەهێز بکاتەوە پێویستە جارێکیتر هێزەکانی کۆ بکاتەوە وەگەر هاتو هێزەکانی کۆکردەوە ئەوا ناوچە لەدەست ئەدات ،( **بەهێزبون لەبەرامبەرلەدەستدانی ناوچە ، بەدەستهێنانی ناوچە لە بەرامبەرلاوازبوون)**

## ❖ قــۆناغـی دووەم(هاوســـەنگی):-

ئەم قۆنغە گرنگترین و هەستیارترین قۆناغە بەزۆری پارتیزانەکان تیایدا دەکەونە هەڵەوە وە کارەکانیان لێ تێکەڵدەبێت بەهۆی پەلەکردن لەم هەنگاوە ، پێویستە تێبگەین کە ئەم هەنگاوە بریتیە لە هەنگاوی ڕێکخستنو ئامادە باشی بۆ ئەوەی بگەینە بارێك کە لەهێزدا هاوشانی دوژمن بین وە هیچکات پەلە نەکرێت لەدەستگرتن بەسەر جێگاکانی کە دوژمن چۆڵی ئەکات چونکە دورنیە دوژمن بیەوێت بەخێرای بمان گوازێتەوە بۆ قۆناغی سێهەم لەکاتێکا ئامادەی ئەوەنین.

### سیما ســـەربازیـــەکانی قــۆناغی هاوسەنگـــی:

1. ئازادکردنی زۆربەی ناوچە سەختەکان وە هەندێ لە دیهاتە بچوکەکان.
2. کەمبونەوەی هێرشە ڕاستەوخۆکانی دوژمن لەسەر پارتیزانان وە پشتبەستنی زیاتری بە هێرشی ئاسمانی و موشەکی بۆسەر هێڵەکانی پشتەوەی پارتیزانان.
3. ئاسایش کردنی ڕێگەی نزیکبونەوە لە دوژمن و دروستکردنی ڕێگا بۆ گەیاندنی یارمەتی بە هێزیەکانی پارتیزانان بەڵام پێویستە شاراوەبن بەپێی توانا.
4. دامەزراندنی سەربازگە و بارەگا وە دەرکەوتنی چەکی قورس.

5. دروستکردنی سەرچاوەی دارایی یان سوودوەرگرتن لەو سەرچاوانەی کە توانراوە دەستی بەسەردا بگیرێت لەلایەن پارتیزانانەوە.
6. سەرەتای دەرکەوتنی دەستەواژەی بەرگریکردن لەناوچە بەڵام پێویستی بەوریاییەکی زۆرە پێویستە هەمیشە لەبیرتبێ(**گیانی سەربازی پارتیزان گرنگترە لە دەستگرتن بەسەرناوچەدا**) گەر لەبەرامبەر بەرگری لە ناوچەکان گیانی سەربازان بەفیڕۆئەڕوات بەبەردەوامی ئەوا پێویستە پێش لەدەستچونی بوار بگەڕێیتەوە سەر هەنگاوی یەکەم وە جارێکیتر هەوڵبدەیت دوژمن بخەیتەوە پاقلەکە بەهۆی بڵاوکردنەوەیان(**لێدەو هەڵێ**).
7. سەرەتای جێگیربون و بڵاوکردنەوەی هێڵەکانی بەرگری یەکەمو دوهەمو سێهەم.
8. ئەگەر بەهێزبویت لەم هەنگاوەدا ئەوا وەکو هەڵۆ دابەزە بۆ نێچیرەکەت وەگەر لاوازبویت ئەوا وەکو مشک لەژێر دوژمنەوە هەڵبکەنە.

## سیما سیاســـــیەکانــی قۆناغی هاوسەنــگی:

1. وەرگرتنوبەخشین(مفاوظات):دەستخستنی کات و ئاگربەست و سود وەرگرتن لەکاتەکانی ئەمن و ئەمان و قۆستنەوەی بەڵام نابێ ئاگربەست بەتاڵی دروستبکات بەڵکو پێویستە بە کۆکردنەوەی هێز کۆتاییبێت وە ببێتە هۆی گێڕانەوەی حسابات و تاوتوێکردنیان.
2. دروستکردنی پەیوەندی دەرەکی وە ئامادەکاری بۆ دروستکردنی نیمچە هەرێمێك لە ناوچە ئازادکراوەکان.
3. فراوانکردنی ڕاگەیاندن وە دامەزراندنی تۆڕێکی بەهێز لەم بوارەدا.
4. هەوڵدان بۆ فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتت بە هێواشی و لەسەرخۆ وە بەشداریکردنی هاوپەیمانیەکان لەدژی دوژمن.

## ناوچـــەی خۆڵەمێشـــــــــی:

ئەو ناوچەیەیە کە دوژمن ناتوانێت تیایدا بمێنێتەوە وە هێزی پارتیزاین بەهەمانشێوە گەر بچێتە ناوی پێویستە تیایدا نەمێنێتەوە ، بۆ نمونە ئەشێت بە ڕۆژ هێزی دوژمن بچێتە ناوی بەڵام بەشەو بێتە دەرەوە وە پێویستە زۆر ئاگاداربیت لە مامەڵەکردن تیایدا تا نەگەیت بە سەرئەنجامی شۆڕشگێڕانی سوریا لەساڵی **1979** کاتێ حافظ ئەسەد شاری حما ی بۆ چۆڵکردن تا کۆیانبکاتەوە پاشان بەوپەڕی هێزیەوە گەمارۆیداو تەواویانی لەناوبرد.

**تێبینی:**

*لەم هەنگاوەیا پێویستە دارەکە لەناوەڕستدا بگیرێت لەلایەن پارتیزانان چونکە ئەشێت دوژمن بتخاتە بوارێکەوە کە جەنگەکەی لە شەڕ دژی هێزی پارتی زانانەوە بگۆڕێت بە جەنگ دژی هێزێکی ڕێکخراو ، بۆیە پێویستە بەونەوە بۆستیت کە لەناو ناوچەکاندا پشتیوانان هەبن واتە ماوەی مانەوەت لە ناوچەی خۆڵەمێشیدا ئەوەندە بەسەبیکەیت کە پشتیوانان بۆخۆت دروستکەیت وە پێویستە پشتیوانانی دوژمن لەناوببەیت تیایدا **(ئەو مارەی کە هێلکەکانی هەڵۆ ئەخوات تا نەوەیەك نەمێنێ ڕاوی بکات ئەمەش وادەکات کەمردنی هەڵۆی دایك کۆتای بەهەڵۆکان بێنێت)**

*پێویستە پشتیوانان جیابن لە پارتیزانانی سەرەتا ئەوانەی هەنگاوی یەکەمیان بەسەرکەوتوی تێپەڕاند وە تێکەڵیان نەبن بەڵام ئەتوانرێت کەسانی شایستەیان لێ هەڵبژێردرێت و بهێنرێنە ناو پارتیزانان.

*لە قۆناغی دوهەم ئەگەر دوژمن ناوچەیەکی وازلێهێنا یان ژمارەیەکی کەمی دانا لە پاسەوانی و توندوتۆڵی و قەڵابەندی تیادا کەمکردەوە ئەوا یان تاقیت ئەکاتەوە یان هێزی کەمبۆتەوە بۆیە پێویستە دڵنیابون لە کەمبونەوەی هێزی پاشان هێرشکردن بۆسەری.

## قۆناغی سـێهەم تێکـــشکاندن(هێرشی ستراتیژی):

ناوی هێرشی ستراتیژی لە جەنگی ڤێتنامەوە زیاتر بەڕونی دەرئەکەێت کاتێ ڤێتکۆنگ تەواوی هێزیان بەکارهێنا تا چەند شارێکیان گرت ، هەرچەندە هێزەکانی ئەمریکا لەماوەی چەند هەفتەیەکدا تەواوی ناوچەکانیان گێڕایەوە بەڵام سودی نەبو چونکە ڕای گشتی لە ئەمریکا تەواو هەڵگەڕایەوە وە داوای کۆتایهێنانیان بەجەنگکرد بەمەش سوپا ناچاری پاشەکشە بوو ، ئەم هەنگاوە تێیدا دوژمن لاوازئەبێت و وردە وردە بەرەودوا ئەکشێتەوەو خۆی لەناو بنکەی شارە گەورەکان توند ئەکات بەتایبەتی پارێزگاکان وە پارتیزانان گەیشتون بە سوپایەك کە تواناى ڕوبەڕوبونەوەی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ سوپای ڕێکخراوی دوژمن.

### سیما سـەربازیەکانـی قۆناغـی تێکشکاندن:

1. بچوككردنەوەی هێزەکانی دوژمن تەنها لەناو بنکەی پارێزگاکان.
2. دەسکردن بە دروستکردنی قەڵابەندی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی پارتیزانان.
3. پاراستنی ڕێگاکانی (وشکانی-ئاسمانی-ئاوی) کە بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتیزاناندا ئەڕوات.
4. دەرکەوتنی هێزی ڕێکخراو و سوپای ڕێکخراو.
5. دەسەڵاتێکی تەواو بەسەر ناوچەکانی دەوروبەر و ناوچە سەختەکان.
6. دەستکردن بە هێرشکردن بۆسەر شارەکان لە بچوکەوە بۆ گەورە.
7. هێرشکردن بۆسەر بارەگا ئاسمانیەکانو گرتنیان سیمایەکی گرنگی ئەم قۆناغەیە**(گەرئەتەوێ ناوچە دانیشتوانیەکانت لە مەترسی گەورە بپارێزیت ئەوا پیویستە بارەگا ئاسمانیەکان لەکاربکەون چونکە دوژمنی گەورەی شارەکان فرۆکەیە)**.

## سیما سیاســـــیەکانــی قۆناغـی تێکشـکاندن:

1. دەرکەوتنی جیاوزی لەنێوان بنکەکانی هێز لە ناو حکومەتی دوژمن.
2. جیابونەوەی سەربازان (انشقاق)لەناو سوپای دوژمن.
3. پێشبینی هاتنەناوەوەوەی هێزی دەرەکی چەکدار یان ئابوری دژی پارتیزانان یان دژی دوژمن وە پێشبینی دەرکەوتنی دوژمنی دەرەکی لە کاتێکی زودا.
4. بەشداریکردنی سیاسی بە چڕی.
5. گرنگیدان بەناوچە ئازادکراوەکان لەلایەن پارتیزانان بەشێوەیەکی بەرچاو لەڕوی دارایو خزمەتگوزاری و نۆژەندکردنەوە و دانانی ڕێگری ئاسمانی.
6. دروستکردنی حکومەتێکی کاتی لەپێناو ڕێکخستنی باری ئاسایشی ناوخۆیی.
7. ڕێزگرتنی لە خەڵکی سیڤیل وبەشداریپێکردنیان لەسیاسەت بەڵام لەژێر چاودێریەکی توند تا شانەی خەوتوی دوژمن دزە نەکاتە ناو حکومەت.
8. وریابون لە دروستبونی جەنگی ناوخۆ یان کودەتای سەربازی لەناو سەرکردایەتی پارتیزاناندا.
9. دروستکردنی هۆکارێك بۆ نەبونی هێڵێك بۆ وەرگرتنو بەخشین(مفاوظات) لە حاڵی هیلاکی دوژمن تەنها بە خۆبەدەستەوەدانی ڕازیبە چونکە گەر ئەو لەجێی تۆ بوایە ئەوا ئەشێ بە خۆبەدەستەوەدانیش ڕازی نەبوایە بەڵکو تەنها ڕیشەکێشکردنتی پێ قبوڵبوو.
10. گرنگیدان بە تەندروستی خەڵکو ئاسایشی گشتی ناوچەکانی ژێر دەستی پارتیزانان.
11. پێشخستنی بانگەوازی بە تەواوی توانا.
12. پاکردنەوەی خاکی ئازادکراو لە هەر تۆوێکی جیاکردنەوەو انشقاق وە شکاندنەوەی بوارەکە بەلای حکومەتی نوێدا بەتەواوی.
13. دروستکردنی ژێرخانی ئابوری بەهێز بەسودوەرگرتن لە خاك ئەوەی لە ژێریایەتی و ئەوەی لە سەرەوەیە(ئەسەری کۆن-ناوچەی گەشتو گوزاریەکان و نۆژەند کردنەوەیان-مەعدەن و مادەی خامی ژێر زەوی-نەوت غاز-بەروبومی سەرزەمینی-کشتوکاڵی..........هتد)

*لە قۆناغی تێکشکاندندا پێویستە هێزەکانی پارتیزانان بڵاوەنبەوە بەڵکو پێویستە دابەشبن لەگەڵ دوژمن بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا یان باکور و باشور وە ئەمەش لە شوێنێك بۆ شوێنێکیتر ئەگۆڕێت وە هەروەها پێویستە هێڵێکی بەرگری بەهێز دابنرێت لە سنوری ناوچەکانی ژێردەستدا ، وە لەم کاتەدا چ دوژمن چ پارتیزانان هەوڵئەدەن شانەی خەوتو لە ناوچەکانی یەکدیدا دروست بکەن.

*لەحاڵی لاوازبوندا لە قۆناغی سێهەم پێویستە پارتیزانان بگەڕێنەوە سەر هەنگاوی یەکەم وە لەوێوە دەست پێبکەنەوە لەگەڵ چاککردنەوەی هەڵەکان یان گەر دوژمن توانای گرتنی ناوچەکانی ژێر دەستی پارتیزانانی نەبو لەگەڵ لاوازیشیان ئەوا پێویستە لە ناوچەکانی دوژمن دوبارە جەنگی پارتیزانی دروست بکرێتەوە بە تەواوی هەنگاوەکانیەوە.

*پاراستنی ناوچە سەختەکان گرنگە بۆ پارتیزانان پێویستە ببێتە ناوچەی هەمیشەی هەتا ئەگەر جەنگ شکستیشی خوارد پێویستە ناوچە شاخاویەکان بنکە پارتیزانانبێت و جارێکیدی نەگەڕێتەوە دەستی دوژمن.

## مەیدانەکانی جـــــەنگی پارتیزانـــــی:

1. **شـاخ**: ئەرکـی ئامێرەکان لەکار ئەخات.
2. **دارستانەکان**: ئەرکـی فڕۆکەکان لەکار ئەخات.
3. **شارەکان**: باشترین کار تیایاندا دروستکردنی شانەی خەوتووە.
4. **بیابان و لادێ دورە دەستەکان**: تاڕادەیەك گونجاون

*لە دانایییە ئەگەر  سەیری هێزی دوژمنەکەت بکەیتو لەسەر ئەو بنەمایە مەیدان هەڵبژێریت.

## تایبەت مـەندیەكانـی جـەنگاوەری پارتـیزان:

1. بە شێوازی ڕێكخراو(سریە-كتیبە-لیوا.....) ناجوڵێت.
2. پەیوەستنیە بە ناوچەوە وە هیچ سنورێكی نیە و بەرگری لە ناوچە ناكات.
3. هێڵی گەیاندنی یارماتی دیاری نیە ، یان هەر هیچ هێڵێكی یارمەتی نیە.
4. خەڵكی ناوچەی جەنگە، (بە كەسێ ناوترێ جەنگاوەری پارتیزان گەر خەڵكی ناوچەی جەنگ نەبێت) چونكە پێویستە بە ئاسانی تێكەڵاوی خەڵكی ناوچەكە بێت وە توانای خۆ ونكردنی تیایاندا هەبێت.
5. بەتەنیا جەنگاوەرێكی پارتیزان پێویستە وەكو سوپایەك بێت وە زانیاری لەسەر هەمو جۆرە چەكێك و تایبەت مەندیەكی سەربازی هەبێت.

*سەربازێكی جەنگی پارتیزانی بە 100جەنگاوەری ڕێكخراوە ئەگەر 100جەنگاوەر بەسەركردایەتی ئەفسەرێك هێرش بكەن گەر بتەوێ هەر 100 سەربازەكە لەكار بخەیت ئەوا ئەونەت لەسەرە كە ئەفسەرەكە لەناوببەیت، بەڵام سەربازانی پارتیزانی پەیوەستنین بە سەركردەوە لەمەیدان بۆ بەردەوامیان لە جەنگ، وە گەر بتەوێ زرێپۆشێك لەكار بخەیت ئەوەندەی پێویستە ئەوەیە بزانیت هەر زرێ پۆشێك لە سێ سەرباز پێك هاتووە **شۆفێر** – **پێشەوا** - **تەقەكەر** ، بە نەمانی هەر كامیان ئەوا فەرمانی زرێ پۆشەكە لەكاردەكەوێت.

## پێكهاتەی جەنگی پارتیزانی هاوشێوەی پێكهاتەی لەشی مرۆڤە:

1. **ئێسك**: لاوان
2. **دەمارەكان**: داهات(پارە)
3. **بازوو(ماسولكە)**: ئامادە باشی و چەك عەتات.

*لە جەنگی پارتیزانیدا بیر مەكەوە لەكۆتای هاتنو دەست پێكردن بەڵكو بیربكەوە لە بەردەوامبون.

## قۆناغە لاوەکیەکانی جەنگی پارتــیزانی:

1. سەرهەڵدان.
2. قۆناغی پێ هەڵبژاردنی دوژمن.
3. قۆناغی کۆ بونەوە.
4. قۆناغی دەسکردن بە دەستگرتن بەسەر ناوچەدا.
5. قۆناغی پێشبڕکێ لەگەڵ دوژمن.
6. قۆناغی جیاکردنەوە و کۆتای پێهێنان.

## تکــتیکەکانی جەنگــی پارتیــزانی:

یاسای جەنگاوەری پارتیزانیە کاتێ دائەبەزێت هەر مەیدانێك یان جێگەیەك یەکەم کار کە ئەیکات نەخشە کێشیەکی تەواوی بۆئەکات لە مێشکی خۆیدا وە نەخشەیەکی بەرگری بۆ دائەنێت جا ئەگەر شوێنەکە پێویستی بە بەرچاوگیری بوو ئەوا بەرچاوگیری و ڕەسەدی بۆ ئەکات وە بۆ بەرچاوگیری دەرئەچێت بەپێی پێویست وە پێویستە تەواوی دەرچەو ڕێگەکانی ئەو جێگەیە بزانێت وە هەموشتێك لەبارەی سروشت و کەشو هەواوە.

## چۆنیەتی دیــــاریکـــــردنی شوێن:

- دورکەوتنەوە لە دۆڵو ناوچە نزمەکان چونکە لەوانەیە لەسەرت دابخرێت وە بەهەمان شێوە دورکەوتنەوە لە ناوچە نزیکەکان لە ڕێگاکانەوە.
- بەرزای شاخەکان ماڵی پارتیزانانە.
- جەنگاوەری پارتیزان وەکو پشیلەیە ناچێتە جێگەیەکەوە گەر زیاتر لە ڕێگەیەکی نەبێت بۆ هاتنە دەرەوە.
- خاڵی لاوازی جێگەکەت بزانە لە جەنگی پارتیزانیدا و هەژماری بەرزاییو دۆڵو دەشتەکان بکە تا بتوانیت هێزی ئاگرین بە باشی دابەش بکەیت.

## دابـــەشکردنی گروپـــەکان لە بـەرزاییەکاندا: (بۆنمونە)

ژمارەی گروپەکان 4 گروپ وە هێزی ئاگرت هەیە بە ڕێژەی 20 ئەتەوێ دابەشیان بکەیت ، پێویستە سەیری ڕێگەی ئاسانەکان بکەیت کە دەتوانرێت بە ئاسانی هاتنە ژورەوە بکرێت لەڕێگەی ئۆتۆمبێلو تانک و زرێ پۆشەکانەوە لەسەریان چەکی دژە تانک دابنێ کە لە زۆربەی کاتدا تاقمەکەی لە 2 کەس پێکدێت ، پێویستە ئەو چەکە لە ناوچەیەکبێت کە بروانێت بەسەر ڕێگەکەدا هەتاکو ئەگەر هەر ئامێرێك دەرکەوت تەقەی لێبکات ، گەر بە جۆرێکی باش ئەو لایەنە بپارێزیت ئەوا 1/3 هێزی دوژمنت لەکار خستووە ، کە بریتیە لە هێزی ئامێرەکان ، بەمەش 2/3 ی هێزی ئەمێنێتەوە کە پیادەیە لەگەڵ هێزی ئاسمانی و تۆپ هاوێژ وە تازیاتر بەرز ببیتەوە ئەوا زیاتر هیزی ئامێریو پیادە لەکار ئەکەون ، ئەوەی ئەمێنێتەوە هێزی ئاسمانیە کە لەڕێی دژە ئاسمانیەوە چارە ئەکرێت گەر بەردەستبێت وەگەرنا ئەوا پێویستە بەتەواوی شاردنەوەو نادیاری و کۆمۆ فلاش بەکاربهێنیت.

## چـــۆن بنـــکـــە و بازگە لە بـەرزاییـەکاندا دیاری ئـەکەیت:

1. هەڵەیەکی گەورەیە گەر هەمو گروپەکە لە یەك ناوچەدا کۆ ببێتەوە لە بەرزاییەکاندا بەڵکۆ پێویستە بڵاوبونەوە ئەنجام بدرێ بەدرێژایی هەموو گۆشەکان وە پاراستنیان.
2. ئاگاداربون لە ناوچەی کوێر: ناوچەی کوێر ئەو ناوچەیەیە کە ناکەوێتە ژێر چاودێریەوە یان سەختە بخرێتە ژێر چاودێری.
3. پێویستە لە هەندێ کاتدا بۆ ڕێگرتن لە دزەی دوژمن ، دارەکانی چواردەوری چیاکە ببڕیت بەجۆرێك تەنها ئەو شوێنانەی کە سەد لە سەد بونی تۆی تیایە داری تیا بمێنێت بۆ شاردنەوەی تۆو ئاشکراکردنی دوژمن.




4. پێویستە ئەو شوێنەی کە هەڵتبژاردووە تەقەکردن لێوەی ئاسانبێت وە دوژمن لە ژێر ڕوی تەقەکانتبێت.
5. گروپەکانت لە گۆشە مردووەکان دانێ وە وا لە دوژمن بکە ناچاربێت لە گۆشە زیندووەکانەوە پێشڕەوی بکات.
6. دروستکردنی تۆڕێکی خەندەقین تا یارمەتیت بدات بۆ خۆ پاراستن لە تەقەی دوژمن و پێکانی لێدانەکانی کە دەیهاوێژێت.
7. ئەگەر شوێنی خاڵەکانی تەقە کردنت کەوتنە پشت یەکەوە ئەوا پێویستە یان قەڵابەندی بکەیت بە کیسی پڕ لە خۆڵ لەدوای خەندەقەکان تاکو جەنگاوەرانت یەکتر نەپێکن یان پێویستە بە قادرمەی دایانبنێیت بەجۆرێك ئەوەی پێشەوە بە دوومەتر لە ژێر ئەوەی دواوەبێت وە هەروەها......وە بە هەمانشێوە پێویستە کیسی پڕ لە خۆڵ لە پێش خەندەقەکان دابنێیت.
8. ئەگەر هەر دەرچەیەکت بینی کە ئاسانبوو بۆ هاتنە ناوەوەی ئامێرەکان ئەوا پێویستە چەکی دژە زرێپۆشی لێدابنێیت.




*جەنگی پارتیزانی لە چیاو شوێنە سەختەکان پێویستە تیایدا ئەم یاسایانەی لای خوارەوە تێبگەیت:

1. چۆن شوێنی بنکەی پارتی زانان دیاری ئەکەیت جێگەی دەرچونو گەڕانەوە(دانانی خاڵی کۆبونەوە و دەرچون پێویستە لە ناوچەکانی دوژمن بێت بەتایبەتی ئەوانەی کە سەختو دورە دەستن بەسروشتی ، وە هەروەها بنکەی دابینکردنی پەیوەندی).
2. تایبەتمەندی بنکەی پارتی زانان پێویستە سەختو قەڵابەند بێت.
3. بنکەی دەرچونی مەفرەزەکان ئەو جێگەیەیە کە پارتیزانان بۆ ماوەیەکی کاتی دەستی بەسەرا ئەگرن پاشان دوای جێبەجێ کردنی فەرمانی پێویست پاشەکشەی لێئەکرێت.

***تـێبـــینـــی:-**

***ناوچە سەختەکان:** بە دەستگرتن بەسەریدا تایبەت مەندیەکت پێئەدا لەسەرو دوژمنەوە ئەمەش خاکێکی باشە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانە پارتیزانیەکان وە بە دەستگرتن بەسەریدا دوژمن بێ بەش ئەکەیت لە سودوەرگرتن لێێ.

***تێبینی کردنی ئاگرهاوێژی(تەقە):** تێبینی کردن بریتیە لە بینین وە ئاگریش بریتیە لە پێکانی فیشەك لەسەر دوژمن ، سەبارەت بە ئاگر هاوێژی ئەم پرسیارانە لەخۆت بکە؟ چی لێرەدا بتەقێنم؟ بە چ جۆرێك بیتەقێنم؟ئاشکرا یان شاراوە؟
پەیوەندی ڕێگەکانی نزیکبونەوەی دوژمن لێت زۆر گرنگە لە بەرچاو بگیرێت **(ئەگەر ڕێگەی نزیکبونەوە لە خاڵە مردوەکانی ناوچەکەوەبو ئەوا لە بەرژەوەندی هێرشبەرە وە بەپێچەوانەوە).**

*پێویستە خاڵەکانی بەرگری بەجۆرێ دابنرێن کە بتوانن یارمەتی یەکتر بدەن.

***ڕێگرەکان:** هەمو جۆرەکانی ڕێگرە سروشتی و دەستکردەکان کان بخەرە مێشکتەوە کە لەوانەیە بەکاری بهێنیت بۆ خۆ پاراستن ، وەك( لوغم – بەربەستی ئاسنین تەلی درکاوی- داو – خەندەق – دژە زرێپۆش - .......هتد)

***شاردنەوە و داپۆشین:** پاراستنی یەکینەکانت لە ئاگری دوژمن وە بەکارهێنانو قۆستنەوەی هەمو ئەوانەی لەبەردەستن بۆ خۆ پارێزی وەك (ئەشکەوت – تونێل – دارە چڕەکان خۆڵ ......هتد).

***هێڵی نزیکبونەوەو یارمەتی:** پێویستە بەوردی تێبینی هێڵی یارمەتی و نزیکبونەوەی دوژمن بکەیت تا لێی بدەیتو بیپچڕێنیت(**هچ شتێك هێندەی پچڕاندنی هێڵە یارمەتیەکان لەسەردەرونی سەربازی دوژمن سەختنیە)** کاتێك دوژمن هەست ئەکات بەوەی کە گەمارۆ دراوەو خواردن و زەخیرەی بۆنایەت یان هێڵی گەڕانەوەی لە مەترسیدایە ئەوا لەڕوی دەرونیەوە ئەڕوخێت.

*تکتیکی جەنگی پارتیزانی پشت ئەبەستێت بە تێ هەڵکوتان و کمین.

*شوێنی هەڵگرتنی چەکو تەقەمەنیەکانی پارتی زانان پێویستە لە ناوچە سەختو دورە دەستەکانبێت وە پارێزراوبن لە تەڕشوع و ژەنگ وە باشتر وایە تەواوی عەتادەکان لە یەك شوێندا کۆنەکەیتەوە بەڵکو بەپێی ناوچە دابەشبکرێت.

*دورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی نەخشەیەك دوبارەو سێبارە وە بە هەمان شێوە لە هەڵپە کردنو پەلاپەل.

*لەکاتی کوژرانی پارتی زانێك پێویستە تەواوی هەوێ و جەوازو هەرشتێکیتر کە کارت ناساندنبێت دەر بهێنرێت لە گیرفانەکانی تانەبێتە هۆی ئاشکرابونی ئەوانەی پەیوەندیان پێوەی هەبووە.

# جــەنگــی گــورگە تــەنهاکان

ئەم جەنگە باوەڕی بە هیچ کۆ بونەوەیەکی هەرەمی(**سەرکردە-وەزیر-ڕاوێژکاران-ئەندامان-تاکە سادەکان**)نـــیـــــە وە هەروەها ئەم جۆرە جەنگە پشت بە نەخشە و پلانی جەنگی و ڕێکخستن نابەستێت بەڵکو بناغەی جەنگاوەران تەنها بونی فکرێکە وە ئاڕاستە کران لە لایەن کەسێکی دیار یان خاوەن فکرەکە خۆیەوە ، هەموان دەست بەکار ئەبن لە جێگەی خۆیانەوەو بەپێی توانا کوشتاری دوژمنێکی هاوبەش ئەکەن لە ڕاستیا ئەتوانین بڵێین جۆرێکی جەنگی پارتیزانیە بەڵام بە تازە گەریەوە چونکە لە زەمانی تەکنە لۆژیادا هەرچەند نهێنی پارێزی جەنگاوەران بەهێزبێن ناتوانن بەبێ ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان بژین بەڵکو پێویستیەکی گرنگەو پێویستە بەکاربێت لەنێوان جەنگاوەراندا بۆیە زۆرینەی کات بەهۆیەوە ئاشکرا ئەبن بۆیە جەنگی گورگە تەنهاکان ئەشێ پێی بوترێت ڕێ خۆشکەری جەنگی پارتی زانی.

## سیماکانی جەنگی گورگە تەنهاکان:

1. نەبونی هیچ نیشانەو ئاڵایەکی دیار.
2. نەبونی سەرکردەو پێشەوا.
3. نەبونی ناسیاوی لەنێوان گورگە تەنهاکان.
4. نەبونی هیچ جۆرە چەکێکی قورس.
5. پشت بەستن بە چەکی بچوکو سوك وەك(چەقۆ – دەمانچە – کلاشین کۆف – مادەی تەقینەوە – لوغم...هتد)
6. پشت نەبەستن بە شوێن ئەشێت جەنگاوەرەکان تەنانەت لە ڕوی وڵات بەڵکو کیشوەریشەوە جیاوازبن.
7. کاری تایبەتیان بەردەوامبونی زیاندانە لەدوژمن وە بریندار کردنیەتی وە ڕێ خۆشکەرە بۆ دروستبونی جەنگی پارتی زانی.

*پێویستە جەنگاوەرانی ئەم بوارە نەناسراوبن گەر جەنگ گۆڕا بە جەنگی پارتی زانی، چونکە دورنیە دوژمن خۆی جەنگی پارتی زانی دروست بکات تا گورگەکان بچنە ناو پارتی زانانو پاشان بە ئاسانی ڕاویان بکات.

# جەنگی شارو نــاوچەی دانیشتوان

جۆرێکە لە جۆرەکانی جەنگ لە کۆندا بونی نەبوە بەڵکو لەدوای زۆربونی دانیشتوا و دابەشبونیان بەسەر بەشێکی گەورەی زەویدا و ناچاربونی سوپاکان بەگواستنەوەی جەنگ بۆناو ڕێگەو بانەکانو ماڵو خانوەکان کەوەك بەربەست بەکارئەهێنرا لەلایەن هێزە دژکان وە ئەمەش لەجەنگی دووهەمی جیهانی بەشێوەیەکی بەرچاو دەرکەوت وە لە گرنگترین جەنگەکانی ناو شار

(جەنگی شاری ستالین گرات) بوو کە 9 مانگی خایاند و تێیدا سوپای شەشی نازی شکا لەسەر دەستی ڕووسەکان.

*ئەم جۆرە جەنگە زۆر ئاڵۆزە وە لە سەختترین جۆرەکانی جەنگە چونکە دەستگرتن بەسەر شارە گەورەکاندا واتا ئەو لایەنەی دەستی بەسەردا گرتووە بەهێزترە لە لایەنەکەیتر وە نزیکترە لە ڕوخاندنی بەرامبەرو کۆتاییهێنان بەجەنگ وە زۆربەی کات جەنگی شارەکان کۆتای جەنگ یان نزیکبونەوەیە لە کۆتایی ، وە سەبارەت بە هێرشبەر دەستگرتنە بەسەر شارەکەیا و سەبارەت بە بەرگریکەر بەرگریکردنە لەو شارەو دورخستنەوەی هێزی دوژمنەلێ.

## پــایەکانــی جەنگــی شارەکان:

1. **ئامانج:** ئەشێ ئامانج تێیدا سیاسی یان سەربازی یان ئابوری یان دەرونی یان هەمو ئەمانە پێکەوەبێت.
2. **کۆکردنەوەی زانیاری:** سەرکەوتنی نەخشە لە جەنگی شاردا پشت بەو زانیاریانە ئەبەستێت کە لەسەر توانا و ئامادەکاری شێوازی تکنیکی و تکتیکی.....هتد ی دوژمن کۆئەکرێتەوە.
3. **هێزی تایبەت:** جەنگی شار پێویستی بەهێزێکی تایبەتەکە ڕاهێنرابێت لەسەر پاکسازیکردنی باڵەخانە و ماڵو شوێنە گشتیەکان بەتایبەت لە کردەوەی هێرشدا.

4. **پەیوەندی بەردەوام:** یەکێکە لە کارە سەختەکان لە جەنگی شارداو زۆربەی کات توشی پچڕانو تێکچون ئەبێت بەهۆی بۆردومانی بەردەوام بەتایبەت سەبارەت بە بەرگریکەر.
5. **ئاسایشی ناوخۆیی:** بەهۆی بونی ڕێگەو بەربەستی باڵە خانەییەوە کاری ئاسایشی ناوخۆ سەختە وە دوژمن بە ئاسانی توانای کاری پارتیزانی تێدا هەیە.

## تایـــبەت مەنـــدیەکانی شار:

1. **تایبەت مەندی سیاسیی:** بونی دەزگا سیاسیەکان لەناو شرە گەورەکانداو لە پایتەختیشدا بونی کۆشکی سەرکردایەتی و پەرلەمانو دەزگا گەورەکانی بەڕێوەبردن.
2. **تایبەتمەندی ئابوری:** بونی کارگەو بانکو بنکە ئابوریەکانی وەکو ڕێگە بازرگانی و کەنارە دەریاییەکان کە هەندێجار ژێرخانی ئابوری وڵاتن ، بەدەستگرتنی هەر لایەنێك بەسەریاندا تایبەتمەندی ئەداتێ.
3. **تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی:** شارەکان ئەشێت ڕێزێکی تایبەت و گەورەیان هەبێت لەناودڵی خەڵك و کۆمەڵگادا بە ڕوخانی یان پرێزگاریکردنلێی کاریگەری لەسەر باری دەرونی تاکەکان و سەربازان دروستئەکات.
4. **تایبەت مەندی تەکتیکی:** ئەشێ شارەکان پردی پەڕینەوەو هێڵی گەیاندنی دو ناوچەی ستراتیژی بن هەروەها ئەشێت هێڵە ئاسنینەکانیان و تۆڕەکانی ڕێگە زەمینیو ئاسمانیەکان و مەمەڕە ئاویەکانیان تێدابێت کە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر داهاتوی جەنگ دەبێت وە دورنیە لایەنی دەسەڵاتدار بەکاری بهێنێت وەك بنکەیەکی سەربازیو مەخزەنی مرۆی بۆ بەردەوامبونی جەنگ.
5. **تایبەتمەندی دینی و مێژووی:** چەند شارێك لە دونیادا ئەم تایبەت مەندیەیان هەیە کە زۆربەیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو باکور و ڕژهەڵاتی ئەفریقاو ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتو و ڕۆژئاوای ئەوروپان وەك **(شاری قودس-شاری مەککە-شاری مدینە- دیمەشق- حلب-قوستەنتینیا-ئەسکەندەرییە-ڕۆما)** وە بەدڵنیاییەوە کاردانەوەیەکی بەهێزی لەسەر دەرونی زۆرینەی خەڵك هەیە وە تایبەتمەندی گەورە دەداتە کەسی بەدەسەڵات تێایدا.

## تایبەت مەندیە جەنگیەکان لەناو شارەکان:

1. **سنورداری چاودێری:** بەهۆی بونی باڵخانە گەورکان و خانو و تەسکی ڕێگەکان کەڕێدەگرێت لە چاودێریکەرو بینینی ڕاستەوخۆی شتەکان وە مەودایەکی زۆر بۆ خۆ حەشاردان.
2. **تەسکی مەیدانی شەڕ:** لەناو شاردا بەرەکانی جەنگ نزیك ئەبنەوە لەیەك بەجۆرێك زۆربەی کات تەنها یەك شەقام هێڵی ئاگرینە یان یەك دیوار بەرە جیا ئەکاتەوە بەمەش بۆردومانی ئاسمانیو تۆپ هاوێژ لەسەر بەرەکان کەمدەبێتەوە وەزیاتر پشت بە شەڕی نزیکو چەکی سوکو دەسەو یەخە دەبەسترێت.
3. **پشت بەستن بە یەکینە تارەکان:** لەناو شاردا زیاتر پشت بە یەکینەی بچوك ئەبەسترێ بۆ شەڕکردن وە جەنگ ئەبێتە زنجیرەیەك لە شەڕی یەکینە بچوکەکان.
4. **پێویستیەکی زۆربە زەخیرە:** هێزەکان بڕێکی زۆر لە فیشەکو تەقەمەنی بەکاردەهێنن لە جەنگی شاردا بەهۆی پێویستیەکی زۆر بە چاودێری بە تەقە کردن هەیە وە تێدا چەکی سوك و ڕەشاش و دژە تانك و تۆپ هاوێژە سوکو ڕاستەوخۆکان بەڕادەیەکی زۆر بەکاردەهێنرێت.
5. **سەختی پەیوەندی:** یەکێك لە خراپیەکانی جەنگ لەناو شاردا ناهەمواری پەیوەندیکردنە بەهۆی بەربەستی دروستبو بەهۆی باڵەخانەکانەوە وە هەروەها بەهۆی کەمی مەودای بینین هەماهەنگی کاری سەختە.
6. **زۆری ناوچە بەرز ڕوانیەکان:** بونی باڵەخانە زۆر بەرزەکان کەلەنێوان 100-30م دەبێت ئەمەش ئەبێتە هۆی کەوتنی ناوچەکان و شەقاماکان بە دەستگرتن بەسەر ئەم جۆرە باڵەخانانەدا.
7. **ئاسانی خۆشاردنەوەو خۆ ونکردن:** لەیەك چونی جێگەکان و زۆری شوێنە وێرانبووەکان وادەکات کە تێبینی کردن شتێکی زۆر سەختبێت.
8. **زۆری بەربەست و ڕێگرو خانو ژێرزەمین و تونێلی توندوتۆڵ.**
9. **سنورداری بەکارهێنانی چەك:** وەك لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد لە بەرەکاندا کورت ئەبێتەوە لە چەکی سوکدا.

**10 . بونی خەڵکی سیڤیل:** کێشە لە تەقەکردندا و دەستگرتن بەسەر خەڵکە سیڤیل و جوڵەیان لەکاتی کردەوەی سەربازیو دابینکردنی پێویستیەکانیان و ڕوخانی جێگەو بانیان وادەکات کە ڕقیان هەبێت لە هەردوو لای هێرشبەرو بەرگریکار.

## تایبەتمـــەندیەکانی سەربازی جەنگی شار:

1. ئازای و ڕێکو ڕاستیو پەیوەستبون بە فەرمانەکانیەوە.
2. ڕهێنانی بەردەوام.
3. زانیاری بە وەرزشی بەرکور.
4. پشت بەستن بە خودی خۆی و توانای کارکردن بە تەنها وە کارکردن بە ڕوحی تیم.
5. زانیاری تەواو بە خەڵکە سیڤیلەکە و بە توانای دوژمن.

## مەیدانی جەنگی لە شارەکاندا ئەکرێ بە 4 ئاستەوە:

1. **ئاستی باڵەخانە و خانوەکان:**

- داپۆشەرو بەربەستە.
- تا ڕادەیەکی باش گۆشەی چاودێری و تەقە دابین ئەکات.
- ڕێگری جوڵە ئەکات یان تەسکو لاوازی ئەکات بەتایبەتی ئامێرە سەربازیەکان.
- هەروەها شوێن گەلێکی باش دابین ئەکات بۆ هێرشبردن لە بەشی سەرەوە وە تەقە کردن لە ئامێرەکان لە بەرزاییەوە.

2. **ئاستی ڕێگە و شەقامەکان:** شەقامەکان هۆکاری پێشڕەویو پاشەکشە دابین ئەکات.
3. **ئاستی ژێر زەمینی:** سەختە چاودێری کردنی ، وە ئەم ئاستە ئەشێ گەورە و گشتگیربێت وەك میترۆ و تونێلو ئاوەڕۆکان ئەگرێتەوە بۆ نمونە شاری لۆس ئانجلوس زیاتر لە 200میل لە ئاوەڕۆ ئەکەوێت ژێر زەویەوە ، وە ئەم ئاستە

گونجاوە بۆ بەکارهێنانی لەلایەن هەردوو هێرشبەرو بەرگریکار بۆ پێجدان لە دوژمن و لێدانی لە کەمەرەوە هەروەها کاری کمین و هێرشی هەڵگەڕاوە و دزەکردن ئاسان ئەکات.

4. **ئاستی ئاسمانی:** کۆتا بەکارهاتوی ناو جەنگی شارەکانە ئەشێ بەکاربهێنرێت بۆ لێدانی هێڵەکانی دواوەی بەرەکانی شەڕ یان بۆ دابەزاندنی خێرا و دەرهێنانی هێزو پێویستی و دەسکەوت وە مەترسی سەر فڕۆکە هێڵەکانی کارەباو بورجە بەرزەکان و دژە ئاسمانیەکانی ناو شارە.

## فیکرە سەرەکیەکان لە جــەنگــی شارەکاندا:

1. جەنگی شار بە پلەی یەك پشت بە پیادە دەبەستێت.
2. لەوانەیە لە ڕوبەڕوبونەوەی تەکتیکیدا شوێن پێی دور مەدا بەجێبهێڵێت ، بەجۆرێك کە ئاستەکانی ستراتیژیو تکتیکی نەبڕێت ، کەوا لە کارە تکتیکیەکان ئەکات کە ڕوگەی ستراتیژیو کردەوەگەری هەبێت و جێی ئەوان بگرێتەوە.
3. سەرکردەکان لەسەر هەمو ئاستەکان پێویستە تێبگەن لە کاریگەریەکان ڕاگەیاندن و کاری لەسەر داهاتوی ئامانجەکانی کردەوەگەریو و ستراتیژی.
4. پێویستە عقیدەی جەنگی و مانۆڕ و جوڵەی زیرەکانە جێبەجێ بکرێت.
5. بواری سیخوڕی بەشێکە کە پێویستە سەرەکی بێت لە جەنگی شاردا.
6. زرێپۆشو تۆپهاوێژو دورهاوێژو موشەکو فڕۆکە جەنگیەکان کاریگەریان لەسەر چواردەوری بەشی دەرەوەی شاردا هەیە بۆ تەراکردنی دوژمن یان ڕێگرتن لە گەشتنی یارمەتی.
7. زرێ پۆشە کارکەرەکانی ناوەوەی ناوچە باڵەخانەییو ماڵەکان پێویستە پیادە پارێزگاریان لێبکات.
8. ئەو تۆپهاوێژەی کە لەناو ناوچەی باڵەخانەیدا کاردەکات تەنها کاریگەریەکەی بۆ لاوازکردنی خاڵە بەهێزەکانو ڕماندنی قەڵابەندیەکانە.
9. چەندێ ژمارەی هێرشبەران زیاتربێت لە ژمارەی بەرگری کاران ئەوەندە ماوەی کەوتنی شار کەمدەبێتەوە.

10.جەنگی شارەکان توانایەکی زۆر بەفیرۆئەدەن.

## تکتیك لە جـــەنگی شـارەکان:

- **چۆنیەتی جوڵە کردن لە ناوچە باڵەخانەییەکان:**

پێویستە سەرباز گواستنەوە و جوڵە ئەنجام بدات لە ناوچە باڵەخانەییکاندا بە شێوەیەکی وردو خوێندنەوە بۆکراو نەك بەشێوەی خۆ نواندن وە ئەمەش لەبەر ئاشکرا نەبونی گواستنە وەو جێگۆڕکێکانمان تا لەلایەن دوژمنەوە ئاگرمان بۆ نەهاویژرێو و شوێنەکانمان ئاشکرا نەبێت ، وە بۆ کەمکردنەوەی بەئامانج گیریمان لەلایەن دوژمنەوە چەندێك بتوانین.

## هەشت یاسا بۆ جوڵەکردن لە ناوچەی باڵەخانەیدا:

1. خۆدانەواندن بەشێوازی خۆ بچوککردنەوە هاوشێوەی پیری پشت چەماوە.



2. لەکاتی ناچاربونت بە وەستان بە زەویەوە بنوسێ یان خۆت بچوك بکەوە لەپاڵ بەربەستێکدا.
3. چەند ئەتوانی خۆت لادە لە ناوچەی کراوەو ئاشکرا ،بەڕوی دوژمن وەك جادەو مەمەڕو مەیدانی فراوەن.
4. شوێنی گەشتنی داهاتوت دیاری بکە پێش دەرچونت لە جێگەی خۆتە وە ئەبێت دڵنیابیت کە لەو جێگەوە لە تەقەی دوژمن ئەپارێزرێیتو توانای گەشتنت بە ئامانج ئەبیت لەوێوە.




5. جوڵەکانت بشارەوە لەبەر چاوی دوژمن لەڕێی جوڵەکردن لەناو باڵەخانەکان یان لەڕێ خۆشاردنەوە خۆدانەپاڵ دارو پەردو وە هەرشتێك کە ئەتشارێتەوە وە بزانە ئەو دوژمنەی کە دوربینی گەرمی بینی پێیە ئەتوانێت لە پشت دوکەڵی نارنجۆکی دوکەڵیەوە بتبینێت.
6. جوڵەکانت بەهیچ شێوەیەك نابێت خەتی تەقەی داپۆشەری هاوڕێ بگرێت(تەقەی هاوەڵانت کە ئەیکەن بۆ ئەوەی تێبپەڕیت) وە پێویستە جوڵە لە دەرەوەی خاڵی چاودێری هاوڕێیابێت جگە کاتی ناچاری.
7. جوڵەکردن بەوپەری خێراییەوە لەکاتی گواستنەوەدا لە جێگەیەک بۆ جێگەیەکیتر.
8. هەمیشە ئامادەبە بۆ جوڵە.

**جوڵە کردن و دەستکردە چەسپاوەکان:**

لە ناوچە باڵەخانەییەکاندا زۆرێك لە جێگەو باڵەخانەو خانو ئەبینین کە پێویستە ببڕدرێن یان تێپەڕ بکرین وەك دیواری خانو باخچەو گۆشەو پەنجەرەو درگاو......هتد.

- **چۆن دیوار تێئەپەڕێنیت:**

پێش سەرکەوتنت بەسەریدا پێویستە چاوبگێڕیت بۆ هەر شتێك کە گوماناویو نا سروشتیەوە پاشان ورد بونەوە لێیو زانینی ، لە ڕۆژدا باشتر وایە لەو جێگەوە ببڕی کە سێبەری تیایە چونکە لە دورەوە وەك خاڵێکی ڕەش دەر ئەکەوێت وە بەشەو پێویستە

ڕوناك نەبێت ، پێویستە لە کاتی سەرکەوتندا بەهچ شێوەیەك لەشت لە دیوارەکە بەرز نەبێتەوە بەڵکو پێویستە پێوەی بنوسێیت هەر وەك ئەوەی بەشێکبیت لێی وە هەروەها پێویستە بەخێرایی بیبڕیت لەڕێی نزمترین لاوە ، هەڵەیە خۆ هەڵدان بەبێ بەرچاوگیری و هەوڵدان بۆ خۆ هەڵدان لە یەك جێگاوە زیاتر لە جارێك یان بمێنیتەوە لەسەر دیوارەکە دوای سەرکەوتن بەسەریدا یان بەسەریا بڕۆی.










**چۆن ئەجوڵێیت لەلای گۆشەی خانو یان باڵەخانە:**

لەبەرامبەر دیواردا گۆشەکان بە مەترسیەکی تەواو دادەنرێن چونکە لە دیواردا چەند خاڵێك ئەشێ بونی هەبێت بۆ بەکارهێنانی لە کردەوەی تێپەڕاندن و خۆهەڵدان بەسەریدا بەڵام لە گۆشەدا ئەو خاڵەی کە ئەتوانرێت تێپەڕاندنی لێوە بکرێت یەك جیگەیە ، جا لەبەر ئەمە پێویستە لەسەر سەرباز پشت گۆشەکە ببینێت پێشئەوەی تێیپەڕێنێت ئەمەش لەبەر کەمکردنەوەی ئەو مەترسیەی لەوانەیە ڕوبدات لەو مەودایەدا کە دیار نیە.

**تێپەڕاندنی گــۆشە بە سەلامەتی پشت دەبەستێت بەم خاڵانەی لای خوارەوە:**

- پێش ئەوەی بجوڵێیت لەلای گۆشەکەوە پێویستە ئەو ماوەیە یان ئەو ناوچەی کە لەدوایەوەدێت بەباشی بپشکنیت تا ببینیت پاکەو خاڵیە لە بەربەست.
- خۆت دەرمەخە لەکاتی پشکنینی ناوچەکەدا تەنها ئەوەندە دەربخە کە تێبینی ناوچەکەی پێبکەیت.
- بە نزمی بمێنەوە یان بە پاڵ کەوتوی بەپێشدا ، سەرت نزم بکەرەوە بۆ ئاستێکی کەمتر لەو ئاستەی کە دوژمن گومانی بۆ دەبات.

- له باری دڵنیا بون لەسەر ئەوەی کە هیچ دوژمنێك نیه لە پشت گۆشەکەوە ئەوا بە نزمی بجوڵێ.

**ڕێگەکانی بەرچاوگیری گۆشە:**

- بەرچاوگیری و گەڕانەوە بە تێڕوانینی خێراو لە پڕ.



- بەرچاوگیری و کار ، تەرکیز ئەخاتە سەر مامەڵەکردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ دوژمنی ئاشکرابوو.



- بەرچاوگیری بەبەکارهێنانی کەلوپەل وەك(ئاوێنە-موبایل-کامێرا) ئەتوانرێ پێکەوە ببەسترێن یان داری تایبەت (داری سێلفی) بەکاربهێنرێ بۆ چەسپاندنیان.
- بەرچاوگیری لەرێی جوڵەوە(دابەشکردنی گۆشەکان) وەك ئەم وێنەیە.



**هەڵە باوەکان لە بــەرچاوگــیری گۆشەدا:**

لە باوترین هەڵەکان ئەوەیە کە سەرباز بەرچاوگیری بۆ دوای گۆشەکە بکات وە لەوکاتەدا بەبێ ئاگایی چەکەکەی لەپێش دەرکەوتنی سەریەوە بڕوات وە ئەمەش وادەکات کە دوژمن چەکەکەی ببینێتو چاوەڕوانی بکات لەگەڵ دەرکەوتنی بەشەکانیتری لەشی ئاگری تێبگرێت ، هەروەها لەهەڵە باوەکانیتر ئەوەیە کە سەرباز هەستێت بە ئامازەکردن بەچەکەکەی بەجۆرێك کڵاوەکەی بخاتە سەر لولەی چەکەکەی وهەڵی بسوڕێنێ بۆ ڕاکێشانی سەرنجی دوژمن یان قەناص بەڵام ئەم فێڵە تەنها لەگەڵ قەناص بەدەستە بێ ئەزمونەکاندا لەوانەیە سودی هەبێت ، چونکە گەر قەناص شارەزابێت ئەوا چاوەڕێ ئەکات تا سەربازەکە بەتەواوی دەر بکەوێت پاشان تەقەی لێبکات.

**چۆنیەتــی جوڵەکردن بەبەردەم پــەنجەرە:**

پێویستە لەکاتی جوڵە بەبەردەم پەنجەرەی ژێر زەمینی یان لەدیواردا هیچ بەشێکی لەشی سەرباز دەرنەکەوێت بەم جۆرەی لای خوارەوە.








*ئەتوانرێت بۆ سەرلێشێوانی دوژمن بوکەڵە بەکاربهێنرێت لە پەنجەرەکانەوە بۆ دان ڕۆکردن و خڵافاندنی ، بەدڵنیاییەوە ئەمە لەدوای لەبەرکردنی جلوبەرگی سەربازی.

## چۆن ئەجوڵێیت لە ناوچەیەکـــی کراوەدا:

- **ناساندن:**ناوچەی کراوە بەو ناوچەیە ئەوترێت کە خاڵیە لە خانو باڵەخانە ، وەك شەقامی فراوان و مەمەڕو گۆڕەپان و باخچە گشتیەکان و سەیرانگاکان.
- **مەترسیداری:**ئەم ناوچانە پێیدەوترێ ناوچەی کوشتنی نمونەی (Kill Zones) لەبەر ئەمە سروشتیە کە لەژێر چاوەدێری هەمیشەیدابن لەلایەن دوژمنەوە ، وە لێدراون بە ڕەشاش و قەناص.
- **چارەسەر:** پێویستە خۆت لابدەیت لە ناوچەی کراوە وە گەر ناچار بویت ئەوا پێویستە شوێن ئەم ڕێنماییانەی لای خوارەوە بکەویت:

1. چەند لەتوانادایە خێرابە لە بڕینیدا.
2. کورتترین ڕێگە بۆ بڕینی بەکاربهێنە بەڵام بەمەرجێ ئەو مەودایە بەهێڵێکی ڕاست نەبێت چونکە ئەوە ئاسانکاری بۆ دوژمن ئەکات و ڕادەی پێکانی ئامانج بەرزدەکاتەوە.
3. سود لە هاوڕێکەت وەرگرە بۆ چاودێریکردنو پاراستنت و بێدەنگکردنی تەقەی دوژمن ، وە بەکارهێنانی دوکەڵ بۆ شاردنەوی جوڵەکانت وە هەروەها بزانە کە ئەو دوژمنەی دوربینی گەرمی بین بەکار ئەهێنێت ئەتوانێت لەپشت دوکەڵەوە بتبینێت وە بەهەمان شێوە بیخە مێشکتەوە کە لەوانەیە لەکاتی بینینی دوکەڵەکە دوژمن بەخێرای سەلیە بەچڕی بکات بەشوێنی دوکەڵەکەدا.






4. دورکەوە لە دەرخستنی شکڵی ئەندازەی لاشەت بەتەواوی بەشێوازی پێری پشت چەماوەو نوشتاوەی ئەژنۆکانت برۆ.
5. پێش دەرچونت ئەوشوێنە هەڵبژێرە کەبۆی ئەڕۆیت بەمەرجێك شوێنێکی باشبێت بۆ وەڵامدانەوەی ئاگری دوژمن و گەیشتن لێوەی بە خاڵی دواتری ئامانجەکەت وە هەروەها پارێزەربێت بەشێوەیەکی باش.
6. پێش دەرچونت لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکیتر بەرچاوگیری بکە بۆ ناوچەکە بەچاوەکانت پاش دیاری کردنی خاڵی داهاتو ، هەوڵبدە کورتترین ڕێگە بۆ گەیشتنتپێی بگرەبەر.
7. ئاگاداری ئاگری هاوێژراوبە لەلایەن هاوەڵانتەوە.
8. ئەگەر هاتو لەنێوان ناوچە کراوەکاندا دیوار هەبو ئەوا باشتر وایە کونیان بکەیت نەك پێیاندا سەربکەویت.



**چـۆن ئەجوڵێیت بەتەنیشت باڵەخانەو خانوەکاندا:**

لەڕاستیدا جێ گۆڕکێی نمونەیی لەڕێی سود وەرگرتن لەبونی باڵەخانە و شوێنە داخراوەکان دەبێت ئەمەش لەبەر شاردنەوەی جوڵەو جێ گۆڕکێی یەکینەکانە ئەوانەی کەپێویست ئەبێت لەسەریان لەناو خانو باڵەخانەکاندا بجوڵێن ، لەگەڵ ئەوەی ئەم جوڵەیە نمونەییە بەڵام هەندێك جار هێزە شەڕکەرەکان ناچار ئەبن کە بەناو باڵەخانە و خانوەکاندا نەڕۆن بەڵکو بەتەنیشتیا جێگۆڕکێ ئەنجام بدەن وە ئەمەش تێیدا لەوانەیە مەترسی زۆر بێتەڕێیان وەبۆ کەمکردنەوەی ئەو مەترسیانە پێویستە شوێن ئەم ڕێنماییانەی لای خوارەوە بکەویت:

1. بەکارهێنانی دوکەڵ وە تەقەی کوێرانە بۆ داپۆشین و شاردنەوەی جوڵەکان وە هەروەها چاودێری کردنی جوڵەی یەکتر وە ئاڵو گۆڕ کردنی داپۆشین بە تەقە بەبەردەوامی.
2. پێویستە جوڵەکردنەکان بەباڵەخانەو خانوەکانەوە نوسابێت بەپێی توانا بەجۆرێك هەر سەربازێك ماوەی نێوان خۆیو دیواری خانوەکان نیو مەتر بێت ئەمەش بۆ:

- هەتا نەپێکرێت بەفیشەکی هەڵگەڕاوە لەدیوارەکە.

- دورکەوتنەوە لە لێك خشان لەدیوارەکە ، کە لەوانەیە بەهۆیەوە دوژمن ئاگاداربێتەوە کە گەر لەودیو دیوارەکەبێت.
- دورکەوتنەوە لە ئەو ئاسن و مەعدەنانەی کە لەووانەیە لە دیوارەکە هاتبنەدەر.

3. مەجوڵێ ئەگەر لە بنکەیەکی داپۆشراوەوە بۆ بنکەیەکی داپۆشراوەتر **نەبو (ئەو شوێنەی پارێزگاریت بۆ دابین ئەکات لە تەقەی دوژمن بریتیە لە بنکەی داپۆشراو)**




4. لەژێر داپۆشین بۆکردنی هاوەڵەکانت بمێنەوە.

## چۆنـیـەتی جوڵەکردن لەناو خانو باڵەخانەدا:

چەند کارتێکەرێکی تایبەت هەن ئەو مەرجانەی خۆیان دەسەپێنن کەپەیوەندیان بە جوڵە کردنەوە هەیە لەناو خانو باڵەخانەکاندا وەئەم کارتێکەرانەش بریتین لە:
ڕێگەی چونەناو باڵەخانەوە(ڕێگەی بەسەردادان) ، بەرزونزمی ، بارودۆخی دوژمن ، بینین ، توانای پەیوەندیکردن.

- لەکاتی جوڵەکردن لەناو خانو و باڵەخانەدا پێویستە لە پەنجەرەو درگاکانەوە دەرنەکەویتەوە.

- بۆ دەرچون لە باڵە خانەدا دەرگا بەکار مەهێنە وەگەر ناچاربویت ئەوا بەخێرای دەربچۆ وە وریای تەڵەو داوبە لەوانەیە بە تەل یان ئامێری هەستیار لوغم ڕێژ کرابیت.
- خانوەکە بەجێ مەهێڵە بەبێ بونی داپۆشەری ئاگرینی هاوەڵ.




## جــوڵەکردن لەنێــوان بنکە جەنگیەکانەوە:

کاتێك کە جەنگاوەر لە بنکەیەکەوە بۆ بنکەیەکیتر ئەگوازێتەوە پێویستە شوێن ئەم ڕێنماییانە بکەوێت:

- بەرچاوگیر کردنی ئەو بنکەی کە ئەیەوێت خۆی پێبگەیەنێت بە چاو.
- پێویستە جوڵەکردن بەپێی باری تەکتیکی بێت (بەشێوەی ئاسایی یان دزەکردن)
- پێویستە ون نەبێت لە دیدگەی هاوەڵانیدا.
- نەچێتە بەر ئاڕاستەی ئاگرو تەقەی هاوەڵانی(ئاڕاستەبڕی لەگەڵ نەکات).
- کاتێك ئەگاتە بنکەی داهاتو پێویستە ئامادەکاری بکات بۆ داپۆشینی جوڵەی هاوڵانی بە تەقەکردنی لە دوژمن و بێدەنگکردنی ئاگری دوژمن.
- پێویستە خۆی بپارێزێت لە تەقەکردن لە سەرەوەی بنکەکەی وە تەقە لەلایەکانیەوە بکات تا هەلی پێکانی لەلایەن دوژمنەوە کەم بکاتەوە.
- پێویستە جەنگاوەر بزانێت کە مەرجنیە هەر شوێنێك ڕێی چاودێری دوژمنی گرت ئەوا ڕێی ئاگرو تەقەش بەهەمان شێوە بگرێت وەك(بەرمیلی بەتاڵ-تەنکی ئاو-پەردە-ئۆتۆمبێلی ئاسای-مێزی تەختە-بلۆکی 10سم-.......هتد) هەروەها

پێویستە ڕەچاوی جۆری ئەو چەکە بکات کە ڕووبەڕوویەتی گەر چەکی مام ناوەندبێت ئەوا پێویستە بزانێت کە دیواری ئاسای ناتوانێت ڕێگەی گولەکانی بگرێت.

- پێویستە دیاری کردنی بنکە لەشوێنێکی کراوە نەبێت کە گومانی گەمارۆدرانی هەبێت لە لایەن قەناصەوە.

**خشتەی ڕادەی بەرگری هەندێ لە مادەکان دژی گولە وپارچە ئاگری ڕاستەوخۆ لە مەودای کاریگەردا:**

| مادده | ئەستوری پێویست | مادە | ئەستوری پێویست |
|---|---|---|---|
| خۆڵ | 1م | دیواری بەردین | 30سم |
| لم | 60سم | **دیواری بەردی بەهێز** | 15سم |
| خاکی گیایی ئاسایی | 80سم | پۆڵا | 1.3سم |
| ڕەگی دار | 35__40سم | ئاسن | 1.5سم |
| ڕەگی سنەوبەر | 1م | چەو | 60سم |
| سەهۆڵ | 2م | فەردە کاو جۆ | 5__6م |

## تکتیکەکانی ڕێگرتنی دوژمن لە ئیقتیحامی باڵەخانەکان:

☒ **تکتیك**: بۆمب ڕێژکردنی تەواوی ڕیزی یەکەمی باڵەخانەکان و کشانەوە بۆ ڕیزی دوای ئەو بەمەرجێك تەواوی باڵەخانەکانی پێشەوە لەژێر چاوەدێری خۆماندابن بەجۆرێك دوژمن نەتوانێت کە بەشە بۆمبڕێژکراوەکان بکەنەوە یان گەر توانای کردنەوەی هەندێکیان هەبو ئەوە نەتوانن هەندێکی تریان بکەنەوە وە هەروەها پیویستە کۆتا بۆمب ویرانکەر بێت بەجۆرێك گەر تەواوی بۆمبەکان کرانەوە لەڕێگەی کۆنترۆڵە ئەو بۆمبە بتەقینریتەوە تا باڵەخانەکە سودی لێوەرنەگیرێت لەلایەن دوژمن ، ئەم تکتیکە لەو جێگانەدا بەکاردیت کە

ڕیزیك خانو ناتوانرێت سودی تەواویان لێوەر بگیرێ بەپێی پێویست وە ترسی گەمارۆدرانی لێئەکرێت ، یان هەر هۆکاریکیدی کەوائەکات بەجێبمێنێت.

☒ **تکتیك**:شکاندنی قادرمەو پلیکانەکانی بەشی ژێرەوەی ئەو باڵەخانانەی کە لەژێر مەترسی هاتنە ناوەوەی دوژمنن ، وە هەروەها دانانی گروپێکی پڕچەك بە بۆمبو چەکی ڕەشاشو نارنجۆك و پەیژەی جوڵاو و پەتو گوریس. لەگەڵ هاتنەناوەوەی دوژمن بۆ بەشی ژێرەوەی باڵەخانەکە ئەوا پێویستە لەڕێگەی نارنجۆکەوە بەرپەچ بدرێنەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە بەڵام پێویستە تەواوی بەشی سەرەوە کۆنترۆڵ بکەن وەگەر نا دورنیە دوژمن لە بەشی سەرەوە هەوڵی ئقتیحام بدات.

☒ **تکتیك**:دروستکردنی تونێڵ لەژێر باڵەخانەکاندا بەجۆرێك پاش پاشەکشەکردن تیایدا و هاتنە ناوەوەی دوژمن بۆناوەوە بتوانرێت جارێکیتر لەڕێی ئەو تونێلانەوە بگەڕێیتەوەو وەك کمین وداو بەکاری بهێنی بۆ لەناوبردنی دوژمن ، پارێزگاری بکە لەکوشتنی تەواوی سەربازەکانی دوژمن بەجۆرێك کەس نەتوانێت بزانێت بۆ کوژراون تا دوژمن تکتیکەکەت ئاشکرانەکات و لە باڵەخانەکانی تردا وریابێت لە بونی تونێل و خۆ ئامادەکردنی بۆ بەرپەچدانەوە ، وە باشتر وایە ئەو تونێلانە بەجۆرێ دروست بکرێن کە پاش گیرانی باڵە خانەکە ئەو جێگەیە پێویستی بە دانانی پاسەوانی نەبیت واتە لە بەشی دواوەی باڵەخانەکە بێت.

☒ **تکتیك**:دەوردانی ئەوباڵەخانانەی کە مەترسیان لەسەرە بە خەندەقێکی پان و قوڵ وە دروستکردنی پردێك لە بەشی پشتەوە بۆ هاتوچۆی خۆمان وە ئەکرێت هەمان تکتیك لە هەمو چوار دەوری شاردا بەکار بهێنرێت بۆ پاراستنی.

## کاروباری ناوەکـــی:

### قەڵا بەندی:

- بەهێزکردنو قەڵابەند کردنی خانوو.
- داخستنی دەرچەو ڕۆچەکان.
- بەهێزکردنی دیوارو سەقفەکان وە ئەتوانرێت بەهێزکاری بەدروستکردنی سەقفێکبێت لەدار لەسەرو سەقفەکەوەو دانانی فەردە خۆڵ لەسەری.
- هەڵکەندنی خەندەق.
- بەکارهێنانی ژوری ژێرزەمینی وەکو پەناگە وە پێویستە بە تەواوی قەڵابەندو بەهێز بکرێت و فریاکەوتنی سەرەتایی تیایدا دابنرێت وە دروستکردنی تونێل لەو ژورەوە بۆ دەرەوەی خانووەکە.

### پەدەگی ئاسایشکردن:

- لوغم ڕێژکردنی سەقف و دانانی پاسەوانی تیایدا.
- لوغم ڕێژکردنی پلیکانەکان.
- دروستکردنی کون لەنێوان ژور و خانوە پێکەوە نوساوەکان بۆ گواستنەوەو بەکارهێنانی بۆ جوڵەکردن.
- دانانی پێویستیەکانی ئاگر کوژێنەوە.
- مادە پزیشکیەکان.
- مادەی شاردنەوە و کۆمۆ فلاش.
- ئامادەکردنی شوێنەکە بە پەیوەندی تەلیو بێتەل.
- لابردنی تەواوی ئەوشتانەی کە مادەی گڕگرتنن(فەرش-پەردە-پلاستیك-ئسفنج-.......هتد)
- دروستکردنی تونێل لەنێوان یان خەندەق لەنێوان خانوەکاند بۆ جموجۆڵ و پاشەکشە (**چەند ئەتوانی بەسەرزەویا مەڕۆ**).
- بەستنی ئەو ڕۆچانەی کە لەژێرەوە ئەگات بە باڵەخانەکان یان لوغم ڕێژکردنیان.

- دانانی تۆڕ لە پێش هەمو پەنجەرەکان وەك دژە نارنجۆك.

## جوڵەی ئامێرەکان لەناو شاردا:

ئامێرە زرێپۆشەکان لاوازن لەناوچە باڵەخانەییەکاندا بەجۆرێك کە کۆڵانو کوچەکان ئامادەیە بۆ دژە زرێپۆش وە تا ڕادەیەکی زۆر ئامیرەکان جوڵەیان سنورداره لە جادەکاندا لەبەر ئەمە ئامێرەکان نێچیری کەمین و تەقە لێکرانن لەمەودا نزیکەکانەوە وە هەروەها تانکەکان ئەناڵێنن بەدەست نزم نەبونەوەی تۆپ هاوێژەکەیان و بەرز نەبونەوەیان زیاتر لەو ئەندازەیەی کە دیاریکراوە واتە گەر بە گۆشەی **160** پلە لەسەر باڵەخانەیەك تەقەی لێبکرێت یان لە ژێرزەمینێکەوە لە مەودایەکی نزیکەوە تەقەی لێبکرێت ئەوا توانای دابەزاندنی تۆپ هاوێژەکەی نیە تا بەرپەچی بداتەوە بۆیە پێویستە بۆ بەرپەچدانەوە مەودایەك دور بکەوێتەوە کەلەوانەیە ئەو بوارە نەڕەخسێت هەروەهە بەنزیك بونەوە لە تانك لاواز دەبێو توانای بەرگری نامێنێت وە کوێر ئەبێت بە تێکچونی دوربینەکەی وەزۆر کێشەیتر.



*چەندێك بتەوێت زیاتر تانك بەکار بهێنیت بۆ لێدانی ڕاستەوخۆ ئەوەندە پێویستە لەسەرت پیادە دابنێیت بۆ پاسەوانی کردنی لە هێرشی زەمینی ، جوڵەی زرێ پۆشەکان لە جادەکاندا پێویستیەکی زۆری بە پەیوەستی توند هەیە لەگەڵ پیادەدا ، پیادەو

زرێپۆش ئەتوانن لەکاتی جوڵە کردندا شێوازی چاودێری لایی بەکاربهێنن ئەم شێوازەش تیایدا پیادە پێشڕەوی دەکات بۆپاکردنەوەی لایە باڵەخانەییەکانی ناوچەکەو بەدوایدا تانك دێتو وەك بنکە ناوچەکە بەکاردێنیت بۆ لێدانی ئامانجەکانی دواتر وە هەروەها پێویستە یەکینە پیادەکان بە مەودایەکی دور پێش ڕەوی نەکەن پێویستە لەژێر چاوەدێری تانکەکە بمێننەوە وە هەروەها تانکەکانیش لەژێر چاوەدیری ئەواندا بمیننەوە ، پێویستە تانکەکان هەر دانەیەك لەسەر هەر لایەکی شەقامەکە دابنرێت وە لەسەر ئەوبەشەی کەخاڵی تەرکیزی شەقامەکەیە ، هەروەها لە قاتەکانی ژێرەوی باڵەخانەکاندا جێگیر بکرێن لە کردەوە سەربازیەکان لەناو شارەکان باشتر وایە تانکەکان بەشێوەی جوتە دابنرێن پێویستە تانکەکان لە بەشی دواوەی هێڵی یەکەمبن کە پیادەی تیایە لەوێوە تەقە لە قاتە بەرزەکانی باڵەخانەکان بکەن و ڕێی جیگیربونی دوژمن نەدەن ، کاتێك کە توانای دابەشبونی جوتەیی تانکەکان نەبو ئەوا ئەتوانرێت بەشێوەی قیتار دابنرێن ، وە کاتی جێگۆڕکێ لە ناوچە کراوەکاندا پیویستە بەشێوازێکی باش پەیوەندی و هەماهەنگی بکرێت بۆ دابینکردنی یارمەتی ئاڵوگۆڕکراو چودێری ، وە ئاگری بێدەنگکەر و دوکەڵ بەکاردەهینرێت بۆ شاردنەوەی جمو جۆڵەکان ، وە هەروەها ئەتوانرێت زرێ پۆشەکان بەکاربهێنرێن بۆ لابردنی بەربەستەکان بۆنمونە تەلو داوو تەنکیو بەرمیل....هتد ئەبەسترێت بە تانکەوە بۆ تەقاندنەوەیان.

## ڕوبەڕوبونەوەی هێزی کۆپتەرسواران و دابەزینیان:

- دوای دابەزینیان تەواوی چەکە قورسەکانیان و تانکو بار هەڵگرەکانیان لەدەست ئەدەن وە ئەوەی پێیانە چەکی سوکە.
- لەوانەیە یان زۆرجار هێزی دابەزیو لە گەمارۆدایە یان تەرایە تا ئەوکاتەی هێزی زەمینی دەگات پێیان بۆیە مامەڵەکردن لەگەڵیان لەرێی دروستکردنی چواردەورێکی بەهێزەوە دەبێت سەرەتا.
- لەوانە کۆپتەرەکان بۆ فێڵ بەکاربهێنرێن وە دابەزێت لە ناوچەیەکی جیاواز لەو ناوچەیەی دابەزینی کۆپتەر سوارانی تیا ئەنجام ئەدریت.
- هێرشی کۆپتەر سواران زۆربەی کات دژی خاڵێکی لاوازو کەم پاسەوانە وەگەر هێرش بکاتە سەر جیگەیەکی توندو تۆڵ لەڕوی بەرزو نزمیو پەسەوانیەوە ئەوا

له جێگایەك دادەبەزێت كە شاردنەوەی بۆ دابین بكات وە نزیك بێت لە ئامانجەوە.

- گەر هێزی هەڵگیراو بە كۆپتەر ترسی بونی هێرشی ئاسمانی یان زەمینی هەبێت بۆ سەری ئەوا چەن كۆپتەرێكی هێرشبەر هاوەڵێتی دەكات بۆ بەرپەچدانەوەی هێرشەكان.

## جەنگی نــاوچە ســـەختەکان:-

ئەمیش ناوچە شاخاویەکان ئەگرێتەوە بەهەمان شێوە ئەم جۆرە جەنگە لە کۆندا ڕوی نەدەدا بەهۆی کەم مەودای چەکەکان وە کەم پێویستی دەوڵەتەکان بە ناوچە سەختەکان و نەبونی ئامێری سەرکەوتن بەو ناوچانەدا وەگەر کەسێك ئەم کارەی کردێت ئەوا باجێکی زۆری بەڕوحی سەربازەکانی داوە وەك سەرکەوتنی **هنيبعل** بەسەر چیای ئالب لە جەنگیدا بەرامبەر ڕۆمەکان یان سەرکوتنی ناپلیۆن بەسەر هەمان چیادا لەجەنگیدا بەرامبەر هاوپەیمانان ، بەڵام لەمڕۆی ئێمادا جەنگێکی باوەو ڕێگەیەکی گیراوەبەرە لەلایەن زۆربەی سوپاکان بەڵکو زۆرکات گرتنی چیاکان یەکێکە لە ئامانجە ستراتیژیاکان لەڕوبەڕوبونەوەکان وە هەمیشە ئەوی دەست بەسەر ناوچەیەکی بەرزدا دەگرێ لە مەیدانی جەنگدا ئەوا خاوەنی جێگەیەکی ستراتیژیە بەهەمان شێوە دارستانەکانیش هەمان بابەت ئەیانگرێتەخۆ.



## جـــــەنـــگــی ناوچە تـــەختـەکان:

هەر جەنگێك ئەگرێتەوە کە لە ناوچە بیابانیەکان یان ناوچە کشتوکاڵیەکان ئەنجام بدرێت.

**بـــیابانەکان:** ناسراوە بە نا هەمواری و چۆڵەوانی وە جەنگ تێیدا سەخت و نا جۆرە بە هۆی کەمی یان هەر نەبونی ئاوو خۆراك تەنانەت کەمی گیانەوەران تیایدا وەبونی زیندەوەرۆچکەی زیان باخشی وەك(دوپش کو مارو قۆڕی بیابانی ژەهراوی....هتد) بۆیە بیابان دوژمنی جەنگاوەرە.

### بیابان لە ڕوی ســەربازیەوە:

1. کەمی تەکنیکی بەکارهاتو تیاداو سنورداری تەکتیکەکەن.
2. ڕوتی زەویەکە وای کردووە کە توانای خۆشاردنەوە کەمبێتەوە تیایدا.
3. هەمو جۆرێکی چەك تیایدا بە ئاسانی کاری خۆی ئەکات **(ئاسمانی- تانك – پیادە)**جا ئەو لایەنەی کە خاوەنی هێزی سەربازی گەورەبێت ئەوا لاواز ڕیشەکێش ئەکات لە بیاباندا بەبونی تکتیکی بەهێز.
4. سەختی ڕوبەڕو بونەوە بەهۆی نەبونی ژیان تیایدا.
5. ئەگەری ونبونی تاکەکان زۆر ئاسانە بەهۆی لێکچویی ناوچەکانو نەبونی خاڵی نیشانە وە ونبون لە بیابان واتە فەوتان بەتایبەتی گەر خاوەنی تەکنەلۆژیا نەبیت یان شارەزای بەکارهێنانی قیبلەنماو نەخشە نەبیت.
6. کاریگەرترین هێز لە بیاباندا هێزی تانکو هێزی پیادەیە.
7. زۆربەی کات لە حاڵی بەهێزیدا دوژمن خۆی لائەدات لە ڕوبەڕو بونەوە لە بیاباندا بە هێزی زەمینی بەڵکو تەنها بەهێزی ئاسمانی کارئەکات جگە ئەو ناوچانەی کە داهاتی تیایە.

*باشترین تەکتیك بۆ پێشرەویکردن بەرەو دوژمن ڕۆشتنە بە شێوازی پانی و بڵاو بەرەو پێشەوە وە داپۆشینی زیاترین بەش لە سەر مەیدانی جەنگ.

**ناوچە کـشـتـوکاڵـیـەکان:** زۆربەی کات ئەم ناوچانە دەوڵەمەندن بە داهاتی نیشتیمانی وەدور نیە پایەیەکی پشتێ بەستراوبێت لە ژێرخانی ئابوری وڵات بۆیە ئاگاداربە دوژمن لەم جۆرە ناوچانە بێدەنگ نابێت بەتایبەت ئەگەر ئامادە کاری بەرگری کەمبێت یان تیای نەبێت.

*کارکردن لە زەویە کشتوکاڵیەکان پشتئەبەستێت بە فێڵکردنو لێدان لە دورەوە بۆیە پێویستە سەربازە مردووەکان(لوغم) بەشێوەیەکی چڕ بەکار بهێنیت وە مامەڵە لەگەڵ دوژمندا بکە بە خاکی سوتاو واتە تەواویی ناوچەکانی بکە ژێر لێدانی چڕەوە ، هەوڵبدە بە تەواوی هێزو ڕق لەو ناوچانە بدەیت و بە وردەکاریەوە ، بەخشندەیت گیانی جەنگی دوژمن زیایدەکات بۆیە بەخشندەی لەم جێگەدا بەکار نایەت ، بەهیچ شێوەیەك مەهێڵە دوژمن خۆی بگرێت و بچەسپێت ، چونکە چەسپانی دوژمن واتە پەرتەوازەبونی تۆ وە پشت مەبەستە بە هێزی مرۆیی بەڵکو پشت ببەستە بە لێدان لەدورەوە وەئەمەش باشترە لەکاتی هێرشکردنت پێویستە 2/3 ی هێزی دوژمن تێکبشکێنیت وە پاشان بەوپەڕی هێزەوە هێرشکەرە سەر ئە 3/ 1 یەی کە ماوە وە بەدڵنیاییەوە ناتوانی هێرشی ڕەقت بوەستێنێت.

**خـــاکی ســـوتێنراو:** ستراتیژیەتێکی جەنگیە کەتێیدا هەرشتێك پەیوەندی بە یارمەتی دوژمنەوە هەبێت پێویستەبکرێت بە خۆڵ وە بگاتە ڕادەیەك چیتر سودی لێوەرنەگیرێت لەلایەن دوژمنەوە.

# جـەنگی سارد

ئەمیش بارێکی ناکۆکیە لەنێوان دو دەوڵەت یان زیاتر بەڵام هیچ کام لە لایەنە ناکۆکەکان تیایدا تەنانەت فیشەکێکیش بە ڕاستەو خۆیی بەرەو ڕوی یەکتر ناتەقێنن بەڵکو ئەشێت لەسەر مێزی ڕێککەوتنو گفتو گۆش بەیەکەوە دابنیشن وە گرنگترین نمونەش لەم بوارەدا جەنگی ساردی نێوان ئەمریکاو یەکێتی سۆڤێت بوو لە ناوەڕستی چلەکانی سەدەی 20 بۆ سەرەتای نەوەتەکانی هەمان سەدە.

### هۆکاری دروست بونی ئەم جۆرە جەنـــگە:

1. جیاوازی فیکری وەکو (ئیشتراکی و سەرمایەداری)
2. جیاوازی لەسەر بەڕێوە بردن.
3. یەکسان بونی هێز بەتایبەتی لەسەردەمی بونی چەکی ئەتۆمدا گەر جەنگی ڕاستەوخۆی نێوان زل هێزەکان دروست ببێت ئەوا گۆی زەوی ڕوبەڕوی وێرانبونو تێکچون ئەبێتەوە.

### ڕێچکە سیاسیەکانی ئەم جەنگە:

1. بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامە نهێنیەکانی یەکتر.
2. پاشەکشە کردن لە کۆڕ و کۆبونەوە نێودەوڵەتیەکان.
3. دروستکردن یان جوڵاندنی ناکۆکیەکان.
4. پەرتەوازەکردنی ناوخۆیی دوژمن.

### ڕێچکە ڕاگەیاندنیەکان:

بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و درۆ و دروستکردن ناهەمواری کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای دوژمن وە تەهدیدو و بەڵێن بەلەناوبردن.

### ڕێچکە سەربازیـەکان:

خۆی ئەنوێنێت لە خۆنواندنی سەربازیو دەرخستنی هێزێکی لەڕادە بەدەر و بەتواناتر لە هێزی دوژمن بەجۆرێك کە قەناعەت بەدوژمن بکات کە لایەقی ئەو هێزە نایات.

### ڕێچکە ئــابوریــەکان:

خۆی ئەنوێنێت لە داخستنو نوقم کردنی بازاڕە دەرەکیەکانی دژی بازرگانیەکانی دوژمن وە دابەستنی گەمارۆی دارایی لەسەری.

### ڕێچکەزانســتــیەکان:

خۆی ئەنوێنێت لە بەرەوپێشبردنی زانستو تکنە لۆژیا زیاتر لەوەی دوژمن پێی گەشتوەو بوشێوەیەکی خێرا.

### نمــــونەی جەنگی سارد:

تاکە نمونە لەم جۆرە جەنگە جەنگی نێوان یەکێتی سۆڤێت و ئەمریکا بو کە لە کۆتایدا بە هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت کۆتاییهات وە جیهان گۆڕا بۆ یەك جەمسەر ئەویش جەمسەری ئەمریکیە تا ئەم ساتە ، وە لە ئەزمەکانی نێوان (جەنگی ڤێتنام-جەنگی کۆریا-جەنگی کوبا-جەنگی ئەڤغانی یەکەم).

# جــەنــگی گــەرم

ئەو جەنگەیە کە هەموان لەگەڵی ڕاهاتوین وە ئەزانین چیەو چۆنە ئەمیش لە نێوان دو هێز یان زیاتردا ڕو ئەدات وە لەڕێگەی هێزی سەربازیەوە لە مەیدانی جەنگدا بە تەواوی چەکو عەتادەوە ڕوبەڕوی یەکتر ئەبنەوە ، لە نمونەی ئەم جەنگە زۆرە لە سەردەمەکانی پێشو ، بەڵام ئەم جەنگە دوای جەنگی جیهانی دووهەم بەڕادەیەکی زۆر کەم بۆوە تا ئەوەی لەم وەختەی ئێمەدا گەرمی جەنگەکان کاتیەو جیهان خۆی لێلائەدات ، بەڵکو زیاتر ئەوەی لەمڕۆدا ئەبینرێت جەنگی میلیشیاتە یان بە وەکالەتە و هێزی سەرەکی وڵاتان بەشداری تیادا ناکات.

# جــەنگی ئــەتۆمی

لەدوای ڕوخانی ئەڵمانی لە جەنگی دووهەمی جیهانی تەواوی زانا ئەڵمانیەکان دزران لە لایەن ڕوسیاو ئەمریکاوە وە ئەم زانایانە لەو کاتەدا گەشتبون بە چەکێك کە توانای وێرانکردنێکی بێڕادەی هەیە وە لە هەنگاوەکانی کۆتایدابوون کاتێ ئەڵمانیای نازی ڕوخا ، پاش کۆتاهاتنی جەنگ بەخێرای ئەمریکا توانی بگاتە کۆتای هێنان بەو چەکەو بەخێرای لە یاباندا تاقی کردەوە لە هێرۆشیما و ناکازاکی و بەمەش کۆتایی بەجەنگهێنا، پاش ئەمریکا ڕوسیا گەشت بەدروستکردنی هەمان چەکو شان بەشانی ئەمریکا بونە ئەو دوو زلهێزەی کە خاوەنی ئەتۆم بون وە هەموان چاوەڕوانی دروستبونی ئەم جەنگە بوون کە زەوی بەجۆرێك تێك ئەدات ئاستەمە وەك خۆی لێبکرێتەوە ، وە دروستبونی ئەم جەنگە بەدڵنیاییەوە براوەو دۆڕاوەی تیادا نابێت وە هەمو لایەنەکان زەرەر مەند ئەبن بۆیە ئەم جۆرە چەکە بە کۆدەنگی هەموان بەکارهێنانی قەدەغە کراوە ، بۆ هیچ لایەنێکنیە بەکاری بهێنێت ، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەوە هەموی بەتاڵئەبێتەوە کاتێ لایەنەکان بەڕاستی ئەکەونە جەنگەوە ، وە ئەم جەنگەش نزیکە و زۆرێك لە دەوڵەتەکان خۆیان بۆ ئامادە کردووەو چاوەڕوانی دروستبونی ئەکەن.



# جــەنگـی بەوەکالـەت

بریتیە لە بەکرێ گرتنی لایەنێکی لاواز لەلایەن لایەنێکی بەهێزەوە بەبونی ئەجێندای هاوبەش لەنێوان هەردوولا ، وەك ئەوەی لانی بەهێز داوای بەرپاکردنی جەنگێکی دیاریکراو بکات لە لایەن لاواز وە لە بەرامبەردا یارمەتی بدات لە بەهێزبونیدا یان رزگاری بکات لە دەست لایەنی ناکۆك لەگەڵ لایەنی لاواز یان وەك بەکرێگیراو لە بەرامبەر پارەو ماڵدا شەڕ بۆلایەنی بەهێز بکەن بەبێ ئامانجێکی دیاریکراو.

**نمونـــە:**

***کورد+ئەمریکا**

جەنگی کورد دژی سەدام حسێن و بەعس وە پاشان داعش جەنگە لەپێناو مانەوەی ئەمریکا لەناوچەکە بەهۆی پارێزگاری کوردلێ لەبەرامبەردا کورد بۆتە خاوەنی هەرێمێکی سەربەخۆو ئارام وە پارێزراوە لە لایەن نەتەوە یەککگرتوەکانو ئەمریکا.

***دەوڵەتەکانی ئەفریقای ناوەڕاست+ئەمریکا:**

بەرپاکرنی جەنگ دژی تیرۆر لە هەر ناوچەیەکی ئەفریقای ناوەڕاست پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتانە روبەڕو ببنەوە لە بەرامبەر پاراستنیان لە لایەن ئەمریکاو ئسرائیل ، وە هەروەها پێویستە بنکە ئابوریەکانی ئەمریکاو ئەوروپاو ئیسرائیل بپارێزرێت لەلایەن ئەو سوپایانەوە.

***ئێران+میلیشیا شیعیەکان:**

لەسەر میلیشیا شیعیەکان پێویستە وەلائی خۆیان بدەنە ئێران وە پرۆژەی هیلالی شیعی دروست بکەن لە بەرامبەردا ئێران ئەیانکاتە دەسەڵاتداری ئەو ناوچانەی کە ئەیگرنە دەست وەك سوریا - یمن – لبنان – عراق

## جەنگی بەفیڕۆدانی توانای دوژمن

زۆربەی کات لەڕێی جەنگی بە وەکالەتەوە ڕوئەدات لەسەر ئاستی ستراتیژیەتی دەوڵەتەکان ، بەڵام لەسەر ئاستی تکتیکاتی جەنگی ئەشێت بەهۆی بەرگری کردن لەناوچەیەك کە وەستابێت لە بەردەم گەشتنی دوژمن بە ئامانجێکی ستراتیژی، یان بەرپاکردنی جەنگی پارتی زانی دژی دوژمنێکی بەهێز، وە لەسەر ئاستی تکتیك دیارتری نمونە (**جەنگی ستالین**) گرادە کەتیایدا سوپای شەشی نازیی زیندە بەچاڵ بوو وە لەسەر ئاستی ستراتیژیەت جەنگی ڤێتنام کە بوە گۆڕستانی فەرەنسا سەرەتا وە پاشان ئەمریکا وە هەروەها ئەو هێزانەی کە دژی تیرۆر وەستاون لە داهاتویەکی نزیکدا توشی بەفیڕۆدان ئەبن وەچیتر توانای هێرشیان نامێنێت چونکە لەڕاستیا ئەوان دژی نادیارێك وەستاون هیچ شکڵێکی بەرجەستەی نیە.

### پایەکانی جــەنگی بەفیڕۆدان:

1. شاراوەی و نەبونی شکڵێکی ڕونو بەرجەستە.
2. گەیاندنی گەورەترین زیان بە کەمترین هێز.
3. لێدانی خاڵە لاوازەکان.
4. هێواشکردنەوەی خێرای دوژمن.
5. گاڵتەکردن بە هێزەکەی تا زیاترین هێز بەکاربهێنێت.
6. بێهیوا نەکردنی دوژمن لە گرتنت بەجۆرێك کە بەردەوام هەوڵبدات بۆ ئەوەی لەناوت ببات چونکە گەر بێهیوابو ئەوا هێزەکەی بەفیڕۆ نادات.

*پێویستە لە جەنگی بەفیڕۆدان تەواوی توناکانت کۆبکەیتەوە بۆئەوەی بەکاری بهێنی بۆ لێدانی کۆتایی ئەوکاتەی دوژمن هێزی نامێنێت.

# جــەنــگـــی ئـابوری

ئەم جۆرە جەنگە زیاتر لە جەنگی ساردەوە نزیکە یان بەشێکە لە جەنگی سارد یان پێشهاتی جەنگی گەرمە ، لەڕێگەی گەمارۆی ئابوری بۆسەر دوژمن و لاوازکردنی پاشان دوای هیلاکبونی ئەوکات ئەتوانیت هێرشی بکەیتەسەر ، لەم جەنگەدا هێزەکان زیاتر پشت بە هاوپەیمانی ئەبەستن بۆ گەمارۆدانی هێزی بەرامبەر وەهێزی بەرامبەریش بۆ ڕزگاربونی لە گەمارۆ هاوپەیمانان دەبەستێ نمونەی ئەم جۆرە جەنگە گەمارۆی ئابوری سەر عراق بوو لە نەوەتەکانی سەدەی **20** دا لە لایەن ئەمریکاو ناتۆوە ، وە تیایدا نیو ملیۆن منداڵ گیانی لەدەستدا بەهۆی نەبونی مادە خۆراکیەکانو شیر ، پاش هیلاکبونو بێ توانا بونی سوپای عراقی توانرا چۆك بە عراق دابدرێت وە بە لەناوچونی بەعس کۆتایی هات، وە هەروەها نمونەی گەمارۆی ئابوری لەسەر ئێران بەهەمان شێوە لەلایەن ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیەوە بەڵام ئەم گەمارۆیە تاڕادەیەك شکست خواردوبوو بەهۆی بونی هاوپەیمانی ئێران لەگەڵ ڕوسیاو چەند لایەنێکیتر بە پشت بەستن بە فکری شیعیو یەکخستنی ئەو مەزهەبە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەی وە بەهەمان شێوە گەمارۆی ئابوری سەر کۆریای باکور شکست خواردووە بەهۆی هاوپەیمانی و توانای تەکنەلۆژی بەهێزەو و فرۆشتنی مادە هۆشبەرەکان و ساختەکردنی دۆلار لەساڵەکانی پێشو پێش سەرهێنانی دۆلاری نوێ بە ئاڵۆزکردنی زیاترەوە.

## جەنگـــــــــی کێ بەرکـێ

لەگەڵ تازەی ناوەکەیدا کە کەمێك بەناڕونی داپۆشراوە و نەزانراوە ، ئەم جەنگە بەواتای ئەوەدێت کە لایەنێك دەستپێشخەری ئەکات بۆ جەنگ تەنها لەبەر گومان بون بەدروستکردنی مەترسی لەسەر لایەنی هێرشبەر ، لەپێناو کۆتا هێنان بەجەنگێك کە لەوانەیە گەر دروستبو لەکاتێکی دورتر چارەکردنو کۆتای پێهێنانی مەحاڵبێت ، وە ئەم جەنگە دەخرێتە ژێر ناوی**(جەنگی خۆپارێزی)** لە مەترسیەکی داهاتوو وە هەروەها هەمو گەندەڵەکان بەکاری دەهێنن ، وە ئەم جۆرە لە ناکۆکی نێوان یوسف پێغەمبەرو براکانی دەرئەکەوێ کاتێ خوای گەورە لە سەر زمانی ئەوان ئەفەرموێ(اقتلوا یوسف او اطرحوه ارضا یخل لکم وجه ابیکم) کوشتنی براکەیان لێرەدا جەنگی خۆ پارێزیە چونکە بڕوایان وابو لە داهاتودا کە گەورە بوو باوکیان هەمو باشەکانی ئەوان لەبیر ئەکات و وە ئەو ئەبێتە میراتگری پێغەمبەرایەتی، وە هەرەها وتەی فیرعەون بەرامبەر موسا **(ذرونی اقتل موسی ولیدع ربه)**

بەهەمان شێوە ئەمەش جەنگی پێشڕەوی و خۆ پارێزیە.

## جـەنگی لەناکاو

هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی خێراو غافڵگیرکردنی دوژمنانی ناوەوەو دەرەوە و ترساندنی بەرامبەر ، وە لێدانی دوژمن لەوکاتەی کە ئامادەنیە وە ئەم جۆرە جەنگە پێویستیەکی زۆری هیە بە شاراوەی و نهێنی پارێزی چونکە هەمو بەهێزی ئەم جەنگە بە نهێنی پارێزیەوە وەستاوە وە بە ئامادە نەبونی دوژمن بۆ بەرپەچدانەوەی خێرا ، وە نمونەی ئەم جۆرە لەجەنگ . هێرشی ئەڵمانیا بۆسەر پۆڵندا و پاشان فەرەنسا وە سەرکەوتوبون تیایداو شکست خواردنی هەمان جۆر لە جەنگ بەرامبەر ڕوس.

## جـــەنگـی دەرونی

خواستی شەڕەنگێزی بەدوای خۆیدا خۆگریو چەسپاویو ئازایەتی و پێشمەرگی دەهێنێت ، وە بەپێچەوانەشەوە خواستی دۆڕاوندن بەدوای خۆیدا لاوازی و بێ هێزیو ترسنۆکیو ڕوخان و بێ هیوایی و خۆبەدەستەوەدان ئەهێنێت ، هەمو ئەمانە هیچنیە جگە کاریگەری دەرونی کار ئەکاتە سەر مێشکی مرۆڤ بەهۆی باری دەرەکی و ڕوداوەکانی چوار دەور وەکار دەکاتە سەر عقڵی ناوەکی وە وەکو سلوکێك لەژیانی کەسی کار لێکراو دەر ئەکەوێت ، وە لە بواری جەنگیشدا هەر لایەنێك هەوڵئەدات کاری گەری دەرونی لەسەر دوژمنەکەی دروست بکات هەتا ئامانجەکانی لەڕێگەیەوە بەدەست بهێنێت ، وە جەنگی دەرونی بە یەکەم کاری گەری و گرنگترین کاریگەریە بۆ بەدەستهێنانی بردنەوە لەجەنگدا ، چونکە کاری گەری جەنگی دەرونی لەسەر گرنگترین بەشی سەرباز کار دەکات کە بریتیە لە عقڵو دەرونی ، بەبێ بەرکەوتنی فیشەك یان لێدانێك لەزەوی ئەدرێت ، ئەتوانێت پێش دەست پێکردنی پێکدادان بەکار بهێنرێت وەك **ڕۆمـــــلـی** ئەڵمانی ئەڵێت **(سەرکردەی سەرکەوتو ئەوەیە کە دەستئەگرێت بەسەرعقڵی دوژمنەکەی پێش جەستەیان)**

وە جەنگی دەرونی جەنگی عقڵیە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی سەربازی وە لەگەڵ ئەوەی پێویستە بزانیت کە ئەم جەنگە جەنگی کۆتای پێهێنەرنیە بەڵکو بونی پێویستە بۆ کۆتایی پێهێنانی سەربازی.

### شێوازە بــەکارهاتوەکانی جەنگی دەرونـی:

1. ڕاگەیاندن و بڵاوکراوەکان بۆ دروستکردنو بڵاوکردنەوەی و گۆڕینی ئاڕاستەی خەڵك وە کارکردن لەسەر شعورو ئارەزویان.
2. کارکردن لەسەر لاوازکردنی توانای جەنگی دوژمن وە شك دروستکردن لەسەر دادپەروەری دۆسەی جەنگیەکەی.
3. بەهێزکردنی جەنگاوەرانت بەجۆرێك کە دوژمن بەبینینیان توانای جەنگکردنی نەمێنێت.

*لە جەنگی کۆریادا ئەمریکا بەشێکی تایبەتی دروستکرد بە جەنگی دەرونی ناونرابوو(**دەزگای سەرەکی جەنگی دەرونی**)وە سەربازگەیەکی تایبەت بەو باسە دروستکردبوو و سەربازانی فێرئەکرد لە بەرگریو هێرشبردنی جەنگی دەرونی.

**بواری جەنگی دەرونی بەدوو باردا ئەڕوانێت:**

1. بەرزکردنەوەی باری دەرونی خۆمان.
2. دابەزاندنی باری دەرونی دوژمن و ئەو لایەنەش کە یارمەتیدەریەتی.

*جەنگی دەرونی ڕاستەوخۆ دەرناکەوێت ئەشێ لەژێر ناونیشانی هەواڵێك یان شانۆیەك یان دراما و فیلمێکدا خۆی حەشار دابێت.

**بـناغەکانـی جەنـگی دەرونی: بناغەکانی جەنگی دەرونی پشت ئەبەستێ بەمانەی لای خوارەوە.**

1. پێشکەشکردنی فکرو بیرو بۆچون یان ڕاستی گەلێکی تازە بەنیسبەت کەسی بە ئامانج گیراو یان کەسی گوێگر ، یان بەکارهێنانی ڕاستیەکان لە پێناو ئامانجاکانی جەنگی دەرونی وە هەڵبژاردنی ئەو بیرو بۆ چونانەی کە لەوانەیە دوژمن پێی قبوڵ بکرێت و دورکەوتنەوە لە پێچەوانەکەی ، جا لەبەر ئەمە پێویستە ئەوکەسەی جەنگی دەرونی هەڵئەگیرسێنێت خوێندنەوەیەکی تەواو بکات بۆ شێوازی ژیانی کۆمەڵگەی دوژمن و حەزەکانیان و خواستەکانیان عادەتو تەقلیدەکانیان و پێویستیەکانیان و بیرو باوەڕیان وە پلەی شارستانیەتیان بەباشی ئاگاداربێت.
2. پشتبەستن بە دوبارەکردنەوەی ئەدەبی لەگەڵ جۆراو جۆر کردنی بڵاوکراوەکان تا گوێگر بێزار نەکاتو ببێتە هۆی ڕەت کردنەوەی نامەکەی کە بۆی نێردراوە و ئامانج تیایدا جەنگی دەرونیە ، لەگەڵ بەکارهێنانی هۆکاری ڕاکێشەر.
3. پێدانی پاداشت یان یارمەتی بۆ گوێگرو گرنگی پێدەر.
4. دروستکردنی بارێك لە نارِونی و حەزکردن بە گەڕان لەلایەن کۆمەڵگەی دوژمنەوە بەجۆرێك نامەکە بێت بۆ تێرکردنی و وەڵامێك بۆ ئەو پێویستیەی

ئەو بەدوای ئەگەڕێت ، وە دابەزاندنی ئەو بارە ڕاڕاییەی کە بەهۆی نەزانینی ڕاستیەکانەوە توشی بووە ، لەبەر ئەوەی لەباری نادیاریو لێڵیدا پڕوپاگەندە بڵاو ئەبێتەوە و کۆمەڵگەش وەری ئەگرێت لەبەر خواستی ئەو بەفێربونو زانیاری.

5. گرنگی بونی ڕاستگۆی و ئەمانەت پارێزی لە ئەو نامانەی کە ئەتەوێ بیگەیەنیت تاکو باوەڕپێکراوبێت و جێی متمانەی تەنانەت خودی دوژمنیشبێت.
6. باشتروایە نامەی نێردراو قبوڵکراوبێت لەلای دوژمن ، وە ڕاکێشەربێت چونکە ڕقـــلێبون ڕاستیش ڕەتئەکاتەوە وە خۆشەویستی ناڕاستیشبێت قبوڵکراوە، بۆیە پێویستە خەڵکانی خۆشەویست و قبوڵکراو دیارو ناسراو بەکاربهێنرێن بۆ گەیاندنی ئەو نامەیەی کە ئەتوێت بیگەیەنیت.
7. دورکەوتنەوە لەو نامەو بیرو بۆچونانەی کە پێچەوانەی شارستانیەتی کۆمەڵگەی بە ئامانج گیراوە ، وەك دین و دەستگەیاندن بە پیرۆزیەکانی و عادەتو تەقلیدی بەرز.
8. گومان خستنە ناو دۆسەی جەنگی دوژمن و دورخستنەوەی لە دادپەروەری و بەوەحشیگەری چواندنی یان هەڕەمەکیو نادروستی کارەکانی.
9. دەرخستنی لایەنی هەژاری و بێبەشبون و برسێتی و ناجۆری بارودۆخ ، وە ئاماژەکردن بە نادروستیەکانی دوژمن و کێشەکانی ، وە نزمبونەوەی ڕادەی بژێوی و کەمی نیشتەجێ بون و بەتاڵی و بێ کاری وە ئاستەنگی پرۆسەی هاوسەرگیری وە کێشەی فێرکاری.

10 . دروستکردنی وێنەیەکی ڕەونەقدار و ڕون لەسەر حاڵی کۆمەڵگای دوژمن و نزیکبونەوەی لە خۆ بەدەستەوەدان و قبوڵکردنی بە دۆڕندنی.

11 . دواندنی هەستوسۆزی خەڵکی کۆمەڵگای دوژمن وە ویژدانیان زیاتر لە دواندنی عقڵیان.

12 . دروستکردنی ترسو تۆقاندن لە دەرونی کۆمەڵگاو خودی دوژمندا بەڕادەیەکی زیاد لە پێویست وە گەورەکردنی زیاد لە پێویستی هێزی چەکدیاری لە بەرچاوی دوژمن وە ترساندن بە بەکارهێنانی گەورەترین و بەهێزترین چەکت.

*پێویستە بزانیت کە خەڵکی سیڤیل زیاتر چاوەڕوانی هەواڵی خۆشن زیاتریش باوەڕ بەو هەواڵو نامانە ئەکەن کە باسی کۆتای پێهێنانی ناخۆشیەکان ئەکات و جارێکیتر ژیان ئاسای ئەبێتەوە بۆیە پێویستە بەڵێنی کۆتایی پێهێنانی ناخۆشیەکانیان پێبدەیت چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگای خۆت چ کۆمەڵگای دوژمن.

*بڵاوکراوە دو ئامانجی گرنگی هەیە:لەسەر ئاستی دەرەوی وڵات(دروستکردنی ڕوحی دۆڕن لەلای دوژمن)- لەسەر ئاستی ناوخۆ(پشت قایمکردنی باری دەرونی وە پاڵپشتی سوپاو وڵات لە سەر دۆسەکەت).

## ئــامانجــی بڵاوکردنەوە:

1. جوڵاندی هەستی ڕقلێبونەوە و بێزاری و تورەیی ، و پاشان ئاراستەکردنی بەرەو دوژمن.
2. قەناعەتکردن بە نەوەکانی کۆمەڵگە لەسەر زیاتر نزیکی دۆسە و پرسەکەیان لە حەقەوە (زیاتر لە دۆسەی دوژمن) بە هەمان شێوە هاوپەیمانانت لە جەنگدا وە پاراستنی ئەم بارە دەرونیە.
3. پەرەدان بە هەستی خۆشەویستی و ڕێز بۆ دەوڵەتە ناوەندو بێلایەنەکان بۆ چاندنی دیدی بە حەق بونی دۆسیەکەت ، وە دروستبونی باوەڕلایان کە لە کۆتایدا ئێوە سەرئەکەون.

## بــــە کورتــی:

جەنگی دەرونی سنوری شوێنو کات نازانێت ، بەڵکو پێش جەنگ دەست پێدەکات بۆ ئامادەکردنی بیرو هیزری گەل بۆی ، وە کاتی جەنگ بۆ بەرزکردنەوە باری جەنگی وە دروستبونی بیروباوەڕ بۆ ئەحەقیەتی دۆسیەی جەنگ کە لە پێناویدا ئەجەنگێن وە پاش کۆتای هاتنی جەنگ بۆ پاڵپشتی دەستکەوتەکانی جەنگ وە دامەزراندنیان.

وە هەروەها جەنگی دەرونی سروشتێکی بەردەومی هەیە چونکە کار ئەکات لە ژێرەوە و لەودیو پەردەوەوە دەرناکەوێت بە شێوەیەکی ئاشکرا ، وە هیچ سنورێکی جوگرافی

نازانێت ، وە لە خاسێتەکانی ئەم جەنگە ئەوەیە کە تەنها لەسەر ئاستی سەربازی بەکار ناهێنرێت بەڵکو لەزۆر باری وەك ئابوری و تەکنەلۆژیاو.......هتد

## جـــەنگی دەرســداران

دەستپێدەکات کاتێك بەکرێگیراوێك یان ژێردەستێك دەرئەچێت لە فەرمانی گەورەکەی وەك نەدانی پارەیەکی ڕێکەوتو لەسەری ساڵانە یان بەکارهێنانی جێگەیەك کە ڕێگری کراوە لە بەکارهێنانی یان ڕێکەوتنی ژێربەژێرو خیانەت......هتد
تیایدا لایەنی بەهێز هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی سوپا گەر پێویست بکات یان گەمارۆدانی ئابوری بخاتە سەر لایەنی لاواز یان پێویستیەکی گرنگی لێببڕێت کە ببێتە هۆی تێکچونی باری ئاسای دەوڵەتەکەی.

*ئەشێ ئەم جەنگە تەنها بۆ ترساندنی دوژمن بێت بەبێ هیچ تەقاندنو وێرانکردنێك بە کۆتایهاتن بەو کارە بێفەرمانیەی کە لایەنی لاواز ئەنجامیداوە کۆتایی بەجەنگ دێت لەگەڵ گرتنەبەری چەند هۆکاری بۆ دوبارە نەبونەوەی هەمان بارو دۆخ.

**نــمونە:**

جەنگی پێغەمبەر(د.خ) دژی جولەکەکانی بنی قینوقاع و خیبەر و بنو نەظیر وە هەروەها جەنگە کانی ناپلیۆن لەسەر نەمسا کە لەجاری کۆتاییدا تەواوی سوپاکەی هەڵوەشندنەوەو بێ سوپای کردن.

## جــەنگی تەکتیکــی:

توانایە بەسەر بەدەستهێنانی ئامانجی جەنگ بەوەی لەبەر دەستە لە هێز  بەبێ تاودانی هەمو هێز و وزەکەت یان ئەتوانین پێیبڵێن دەستگرتنەوەو بە بەفیڕۆ نەدانی تواناکانە.

### بەشەکانی جەنگی تەکتیکی:

1. سیاسی:پشتی پێئەبەسترێ بۆ کۆتاپێهێنانی جەنگ.
2. سەربازی:کە پایەی سەرەکی جەنگەو نا مومکینە لێکردنەوەی.

*هەندێجار بۆ جێبەجێکردنی پێویستیەکانی جەنگێکی گەورە ئەم جۆرە جەنگە ئەنجام ئەدرێت و لە کۆتایدا خزمەت بە ئامانجێکی ستراتیژی ئەکات لە جەنگی سەرەکیدا یان وەك جەنگێکی دەرونی خۆی ئەبینێتەوە لە مەیداندا.

## جــــەنگــی جیهانی

ئەم جۆرە جەنگە لە هەمو مێژودا ئەوەی کە پێمان گەشتووە تەنها دوجار ڕویداوە ، لەم جەنگەدا هەمو یان زۆرینەی وڵاتانی جیهان بەشداری تیا ئەکەن وە جیهان تیایدا ئەبێتە دوو بەرە هەر دەوڵەتێکی ناو ئەو دوبەرەیە ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە بەڵام ئامانجێکی سەرەکی کۆیکردونەتەوە ئەویش لەناوبردنی بەرەی بەرامبەرە وەك لە جەنگی دووهەمی جیهانیدا لەنێوان بەرەی هاوپەیمانان دژی بەرەی دەوڵەتانی میحوەر کە بریتیبون لە(ئەڵمانیاو ژاپۆن و ئیتاڵیا.....هتد).

### خاسیــەتەکانــی جەنگــی جیهانــی:

1. بەشداری کردنی ڕاستەوخۆی زۆرینەی دەوڵەتان.
2. بەکارهێنانی تەواوی چەکە قەدەغە کراوەکان.
3. هیچ لایەنێکی بێلایەن بەپێی تێپەڕبونی کات بونی نامێنێت گەر بەویستی خۆی لایەنێ هەڵنەبژێرێت ئەوا بە زۆر ناچارئەکرێت بەوە.

4. تەنها لەڕێگەی دۆڕانی لایەکیانەوە کۆتایی بەجەنگ دێت وەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بە یەکسانی بوەستێت ئەوا جارێکیتر هەڵئەگیرسێتەوە.
5. ئەشێت لەلایەنێك زیاتر لە سەرەتادا بونی هەبیت بەڵام بەهەمان شێوە لەگەڵ ڕۆشتنی کاتدا ئەبێتە دوو لایەنی سەرەکی و هەموانی لەژێردا کۆئەبێتەوە.
6. هیچ هێزێك لەم جۆرە جەنگە قەتیس ناکرێت بەڵکو هەمو توانایەك بەکاردەهێنرێت چونکە جەنگی مانەوەیە.
7. لەدوای هەرجەنگێکی لەم جۆرە کۆمەڵە هێزیك ئەنێژرێنو کۆمەڵێ هێزی نویێ دەرئەکەون لە سەر ئاستی جیهان.

## جـەنـگی ئـیقلـیمـی

هێزی ئیقلیمی بەو دەوڵەت یان کیانانە ئەوترێ کە کاریگەریان لەسەر دەوڵەتانی نزیکیان هەیە لەڕوی سنور یان فیکر یان ئایدۆلۆژیەوە وە ئەتوانن یاریکەربن لەناو حکومەتەکانی دەوڵەتە لاوازەکان وە هێزە ئقلیمیەکان زۆر جار توشی پێکداداان ئەبن بەڵام بە جەنگی بەوەکالەت یارمەتی هێزی دوژمن دار لەگەڵ هێزی ئقلیمی بەرامبەر ئەدەن لەڕوی لۆجیستی و چەکو تەقەمەنی بەڵام بەدەگمەن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەچنە جەنگەوە چونکە دورنیە بگۆڕێت بە جەنگی جیهانی چونکە هێزە ئقلیمیەکان خاوەنی هاوپەیمانانن بۆنمونە (ئێران و تورکیا و چین و ڕوسیا)چەند هێزێکی ئقلیمی گەورەن وە دەورێکی کاریگەریان لە جەنگەکانی ئێستادا هەیە وە ئەشێ ئەم دەورە لەهێزێکەوە بگوازرێتەوە بۆ هێزێکیتر بەڵام جەوهەری هێزی ئقلیمی هەمان جەوهەرە.

## جـەنگـی ناوخـۆ

پێکدادانە لەنێوان چەند هێزێکی ناو وڵاتێك لەسەر هۆکارێکی سیاسی یان سەربازی یان جیاوازی فکر و ئایدۆلۆژیا یان ئامانجەکەی سەپاندنی دەسەلاتی کیانێکە بەسەر ئەوی تریاندا وە زۆربەی کات ئەم جۆرە جەنگە پێشهاتی دروستکردنی دەوڵەتە وە هێزە ئقلیمو نێو دەوڵەتیەکان دەورێکی کاریگەریان هەیە لەسەر دروستبونی ئەم جەنگە وە هەر لایەنێك لە لایەنەکانی جەنگی ناوخۆ ئاراستەکراوە لەلایەن کیانیکەوە کە دەیەوێت ببێتە خاوەنی دەسەڵات ولەدوییدا خێرو خێراتی وڵات لەگەڵ ئەو کیانەدا بەش بکات،

*لە جەنگی ناوخۆدا گەل ئەبێتە چەند بەشێکەوە بەپێی ژمارەی لایەنەکان هەر ناوچەیەك کیانێك لێی بەرپرسەو تیایدا دەسەڵاتدارەو خەڵکانی ناوچەکەش سەر بەو کیانەن وە جەنگ لەپێناو سەرکەوتنیدا ئەکەن.

*ئەم جۆرە جەنگە ئەشێت لە زۆربەی کاتدا جەنگێکی بە وەکالەتبێت ، هەر بەرەیەك تێدا خزمەتی ئەجیندای دەوڵەتێك ئەکات لەپێناو گرتنە دەستی دەسەڵات.

*چەکی بەکارهاتو تیایدا زۆربەی کات چەکی ئاسای و ڕێگە پێدراوە هیچ چەکێکی وێرانکەر بەکار نایەت ، وەگەر بەکار هات ئەوا بەدڵنیاییەوە هێزێکی ئقلیمی بەشداری تیادا کردووە.

## جـەنگی تایفەگەری

جەنگی نێوان دوو هۆز یان دوو مەزهەب یان دوو نەتەوەی جیاواز لەسەر خاك یان چەسپاندنی ئایدۆلۆژیا یان فراوانکردنی سنوری هۆز رودەدات ، وەك جەنگەکانی نێوان شیعەو سونە و هۆزە عەرەبیەکانی دورگەی عەرەبی لە کۆنو نوێدا یان جەنگەکانی نێوان هۆزە ئەفریقیەکان.....هتد.

# (پلانـــــــــی ســــــــــەربازی)

**پلانـــی سەربازی:**-بریتیە لەچەند ئامادە سازیەك کە رێگە ئەدات بە دیاریکردنی ئامانج وە شێوە کاری ئەو ئامانجە و جێبەجێکردنی بەوپەڕی وردەکاری و ڕونیەوە.

## سێ بناغەکەی پلان دانان:

- **ئامانجێکی ڕون:(دیاری کراو-توانای چواندن-توانای بەجێهێنان-واقعی-کاتی دیاریکراو).**
- **زانیاری تەواو لەسەرئامانج:(بارودۆخی زەویو ئاسمان وکەشو هەوا-بارودۆخی دوژمن و چەکو عەتادو توانا و ئامادەکاری و ژمارەی هێزکەی و برکردنەوەو ستراتیژیەت و تکتیکەکانی).**
- **کەسی شیاو بۆ جێبەجێ کردن:(هەمو ئەوانەی باسمانکرد بێسودن و تەنها مورەکەبن لەسەرکاخەزبەبێ بونی کەسانی شیاو بۆ جێبەجێ کردن).**

## پایـــەکانی پلانـــی جەنگی:

1. قبوڵی بچوکترین هەڵە ناکات.
2. بەردەوامبون لەسەر پێشکەوتن(بەکار نەهێنانی هەمان پلان لەگەڵ هەمان دوژمن).
3. کەسێك کە دانەبەزێتە مەیدانی شەڕ ناتوانێت پلان دابنێت چونکە پلان ڕستگۆیانە نابێت ، گەر لە ئەزمونەوە وەرنەگیرابێت.
4. ئەگەر نەخشەکەت شکستیهێنا، ئەوا پێویستە لەسەرت (شێوازی بیرکردنەوەت بگۆڕیت یان ئەوە بگۆڕیت کە نەخشەکەی بەجێ گەیاندووە)
5. خۆت لەشوێنی دوژمن دابنێ، گەر تۆ لەجێی ئەوبیت چی ئەکەیت.
6. لەکاتی نەخشەکێشاندا جێگرەوە(بدیل)دابنێ، وە لەکاتی جێبەجێ کردندا یاسای گۆڕین و تاك جیایی**(استثناء)** بەکار بهێنە.

- **گۆڕین**:واتە جێ گۆڕکێ بە هێزەکان و ئاڵو گۆڕە تکتیکیەکان نەك گۆڕینی ئامانج.

- **شازبون:** هاتنه پێشەوەی بوارهایەك كەلە ژێر بەرچاوگیریەكانو زانیاریە بەدەست گەشتووەكاندا نەبوون تالەكاتی دانانی پلاندا بەرچاو بگیرێن، بۆیە لەم بوارەدا مامەڵەی جیای لەگەڵ ئەكرێت.

7. مەیدانەكە لەپێش خۆت دانێ چەندین جار وە دەیان جاریش بیر بكەوە پێشئەوەی بڕیار بدەیت.
8. لەكاتی نەخشە دانان خوێندنەوەی بۆبكە لە لایەنی سیاسیو كۆمەڵایەتی لەپاڵ لایەنە سەربازیەكە.
9. پێشبینی كردن بۆ خراپترین بارو دۆخ كەلەوانەیە ڕوبدات چونكە(ئەوكەسەی خۆی بۆ ترس ئامادە كردبێت ئەوا توشی ئاسودەی ئەبێت)
10. دیاریكردنی باشترین سەرباز بۆ جێبەجێ گەیاندنی سەختترین كار.

## چــەند پلانێــــكی بەكارهاتوو:

### ❖ ڤــایرۆس:

پشت ئەبەستێت بە ڕوبەڕوبوونەوەی ئازاد ، واتە كار ناوەستێ بە نەمانو لێبونەوەی بەشێك لە هێز، گەر دوژمن هەوڵی لێدانی بەشێكی دا ئەوا هەر بەشێك دابەش ئەبێت بۆ چەند گیرفانێكی جەنگاوەری ، كە هەمان كاری كۆمەڵی یەكەم ئەكات پێش دابەشبونی ، وە پشت دەبەستێ بە تاكی ڕاهێنراو كە هەڵدەستێ بە دروستكردنی گیرفانی تاكەكەسی ئەگەر هاتو گروپەكەی بەتەواوی لەناوچوو بە جێبەجێ كردنی ئەوەی فێری بووە لە ڕاهێنان لە ناو مەیدانی ڕاستیدا.

وە لەسەر دابەشكردنی یەكینەكان بۆ گروپگەلی كاریگەر ڕاوەستاوە ، هەر گروپێك سەركردەیەكی بەتوانا سەركردایەتی دەكات وە گروپەكانیش ئەكرێنە بەش بەشی جەنگاوەری بچوك ، وە ئەم گروپانە بە هێزەوە هێرشئەكەنە سەر هەر ئامانجێكی بەردەست چونكە ناتوانرێت كارەكانی ناو مەیدان یەكبخرێت لەبەر زۆری لێدانەكان ، ئەتوانرێت پشت بەم **پلانە** ببەسترێت لە دوو باردا ئەویش كاتی هەڵوەشاندنەوەی هێرشی پێچەوانەی دوژمنە و هەڵوشانەوەی هێزی خۆمان، واتە هێرشی دەستگرتنەوە بەسەر مەیدان دووبارە ، وە بەكاردێت بۆ پەرتەوازە كردنی هێرشو ئاڕاستە كردنی لێدانی یەك لەدوای یەك و جیاجیا بەرەو ڕوی دوژمن ، چونكە لێدانی یەك لەدوای

یەك بەوردی و دڵنیابونلێیان ، دوژمن لاواز ئەكات ، وای لێئەكات بكەوێتە حاڵی گێژ خواردن ، وە ناتوانێ تێ بگات چی ڕوئەدات لە چواردەوری ، وە پێویستە وای لێبكەیت وا هەست بكات كە بەردەوام جەنگەكە بەرەو پێشەوەیە و بەهێزە ، وە ئەمەی كە ئەكرێت جۆرێكە لەجۆرەكانی دەستپێكی قۆناغێكی تازە لە پێكدادان.

### ❖ نـــاوكـــی:

ئەم نەخشەیە بەجۆرێك ئەبێت كە پێویستە تیایدا بنكەیەكی سەركردایەتی نهێنی دابین بكەیت تائەوپەڕ سنوری باشی لە شاردنەوەدا ، وە چواردەوری ئەم بنكەیە بە 7 هێڵی بازنەی یان كەمتر دەوور ئەدرێت كە توندو تۆڵبن بە قەڵابەندی ، قەڵابەندیەكی گونجاو بەشێوازی كەمبونەوە لە هێزدا بەرەو ڕوی بنكەكە ، وە ئەمە هاوشێوەی ناوكی گەردیلەیە لەدوو باردا **یەكەم**:بازنەكانی دەوری ناوك كە بریتیە لە قەڵا بەندیەكان.
**دووەم**:ئەوەیە كە نە بینراوە پێویستە نە بنكە بینرابێت نە توندو تۆڵیەكانی چواردەوری وە ئەوەش سەنگی نهێنی پارێزییە.

### ❖ پلانی قالە قەڵەوو بلە سیس:

ئەگەر هاتو دوژمنەكەت خاوەنی تواناو دەسەڵاتێكی زۆر بوو ئەوا ڕێگەی (یـــەك پیاكێشان)بەكار بهێنە، وە هەتا تێبگەیت بیر بكەوە: ئەگەر كەسێكی بەهێزی گەورەو خاوەن بازوی بەهێزمان هەبێت وە كەس نەتوانێت ڕوبەڕوی ببێتەوە ، وەلە بەرامبەردا كەسێكی لاواز بێت و لەكاتی سەرقاڵی كابرای بەهێزدا یەك داری ئەستور هەڵگرێتو بیكێشێت بەتەوقی سەریا ، بەڕای تۆ كابرای بەهێز چی بەسەردێت؟؟؟؟ بەدڵنیاییەوە ئەكەوێتە زەوی وەگەر نەمرێت ئەوا بێهۆش ئەبێت بەبێ ئەوەی هیچ بەرگریەكی بۆ بكرێت ، وە ئەمەش نالوێت بۆ كەسی لاواز جگە بە فێڵوفرتو خۆ شاردنەوەو دزەكردن و قۆستنەوەی هەلی گونجاو.
بۆیە پێویستە لەسەرت كە لە لاوازترین خاڵی دوژمنەكەت بدەیت بەجۆرێك دوای ئەو لێدانەی كە لێتدا نەتوانێت هەستێتەوەو لێدانی خۆی بوەشێنێت ، ئەگەر لەمەدا سەركەوتوبویت ئەوا بەسەر بەهێزترین سوپادا ئەتوانیت سەربكەویت بەویستی خوا ، هەمو خاڵە لاوازەكانی دوژمن كۆبكەرەوە بە وردەكاریەوەو پاشان هیچ دودڵ مەبە لە

لێدانیان بەوپەڕی هێزەوە، خاوە خاو بە تەواوی ڕەتکراوەیە لەم جۆرە لێدانەدا ،
چونکە خاڵە لاوازەکان دیاریکراونین وە لەوانەیە بگۆڕێن بۆ خاڵی بەهێز ئەگەر هاتو
دوژمن لێی ئاگادار بووەوە.

## ❖ پلانـــی ڕووبەڕوبونەوەی دوژمنی دابەشبوو:

دوژمن لە خاڵە لاوازەکانتەوە دەستپێ ئەکات بۆیە لەسەرت پێویستە ئەو خاڵانە بەهێز
بکەیت یاخود بیشاریتەوە ، جا ئەگەر ئەوە بە پەنابردن بێت بۆ شێوازی خاکی سوتاو ،
بۆ تەخت کردنی ناوچەیەك بەتەواوی بە هێزی دوژمن.
پشت بە سروشت ببەستە بۆ بەشداریکردن لە قەڵا بەندی.
وە دەست بکەبە کوشتار بۆ پەرتەوازە کردنی دوژمن بە هەمو هێزتەوە وە مەهێڵە
هێرشەکەت ژیاوی خۆی لەدەستبات.
پێویستە بەباشی هێز دابەش بکەیت وە کوێ مەترسیدارتربو پێویستە قەڵا بەندتربێت.
وە بەکارهێنانی سەربازانی مردوو **(لوغم)**.

## ❖ ڕێـــنمونـــی بـــۆ سەرکردە:

لەکاتی ڕوبەڕو بونەوەدا هەوڵبدە خاڵە لاوازەکانی دوژمن بزانیت لەگەڵ ئەو هەلانەی
کە ئەتوانی بیقۆزیتەوە ، وە هێز بەکار بهێنە بەجۆرێك هیچ توانایەك بەبێ سود
هەڵنەگریت و نەیشاریتەوە چونکە ڕوبەڕو بونەوە بریتیە لەو کاتەی کە دیاری کەری
سەرئەنجامە.
هەوڵ مەدە هێرش ببەیت بە هەمان شێوەی هێرشی پێشووت ئەگەر هێزێکی لاوازت
هەبو وە گەر بەهێزبویت ئەوا بزانە **(التکرار یعلم الحمار)** دوبارەکردنەوە کەریش فێر
ئەکات
پێویستە چەندێتی توانای دوژمنەکەت بزانیت تا ئەوەی بۆ ئامادە بکەیت کە پێویستە
وە سەرسام مەبە بە پەرتەوازەبونی هێزەکانی بەخێرایی ، وە هەڵەیەکی زۆر گەورەو
مەترسیدارە گەر وابزانیت دوژمنەکەت تێکناشکێت ، سەرکەوتویی ئەوەیە کە بتوانی
لاوازیەکانت بشاریتەوە تا بەردەوام دوژمن لێت بترسێت.

پێویستە بزانیت چیت ئەوێت وەچی ئەکەیت وەچۆن ئەیبەیتەپێش وەگەر نا ئەوا هێرشەکەت هۆکاری ڕوخانتە.
هەرچەندێك لێدانی دوژمنەکەت بەهێزو ئازار بەخشبێت ئەوە ناگەیەنێت کە خۆتی بۆ بدەیت بەدەستەوە.

ئەگەر دوژمن سەرکەوتوبو لە گیرۆدە کردنت ئەوا ئەو ستراتیژیەتە بگۆڕە کەبۆتە هۆی ئەوگیرۆدە بوونە.
هەوڵبدە دەست بگریت بەسەر ناوچە کاریگەرەکاندا ، وە ناوچەی کاری گەریش هەمو ئەو جێگایانە ئەگرێتەوە کە بەدەست گرتن بەسەریدا تایبەت مەندیەك ئەدا بە لایەنی باڵا دەست کە لە لایەنەکەی بەرامبەردا بونی نیە. ، وەکو بەرزاییەکانو مەمەڕە چیاییەکانو وە ڕێگە تاك دوریەکان کە جێگرەوەی نیە بەتایبەت ئەو ڕێگایانەی کە بە بیاباندا تێئەپەڕێت.

# کـــــۆکـــــردنـــــەوەی زانـــیاری

ئـــەمیش یەکێکە لە پێویستیە گرینگەکانی پلانی سەربازی و هەمو جۆرە کارو کردەوەیەکیتر ، وە هەروەها کردەوەی کۆکردنەوەی گەورەترین رێژەی زانیاریە لە چەند سەرچاوەیەکی جیاوازەوە لەسەر ئامانجێکی دیاریکراو بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانێکی ڕون ، وە کردەوەی کۆکردنەوەی زانیاری هەمیشە و لە هەمو کارێکدا هەنگاوی دوهەمە دوای دیاریکردنی **ئامانج**.

## ســــــەرچاوەکانی کۆکردنەوەی زانیاری:

1. **کۆمەڵەی بەرچاوگیری(استطلاع)**:ئەمیش گروپێکە سەر بە هێزەکانمانەو هەڵدەستێت بە بەرچاوگیر کردنی ناوچەکانی دوژمن لە دورو نزیکەوە ، بەبەکار هێنانی هەمو جۆرە تکتیکو تکنیکێکی بەردەست.
2. **جاسوس(سیخوڕ)**:بریتیە لە کەسێك سەر بە خۆمانبێت یان بە جاسوس کراوبێت لەلایەن خۆمانەوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویستە دوای ڕاهێنانی لەسەر چۆنیەتی کۆکردنەوەی زانیاری بەتەواوی نهێنیەوە ، وە بە جاسوسکردن کارێکی ئاسان نیە بەڵام پێویستە.

## ئەو ئاستەنگیانەی کە دێتە پێشمان لەکاتی بەجاسوس کردندا

- سەختی بەجاسوسی کردن لەناو هێزەکانی دوژمن.
- سەختی چونە ناوەووەی جاسوسەکانمان بۆناو هێزەکانی دوژمن.
- گریمانەی کارکردنی جاسوس لەسەر خۆمان (جاسوسی دوو ڕوو) لەدژی هەر دوولا کار بکات بۆ بەرژەوەندی زیاتر.
- کاتێکی زۆر ئەبات بۆ ئامادە کردنی و ڕاهێنانی.
- کەسانێکی پێویستە کە تایبەتمەندیان هەبێت لە ئازایەتی و قسە زانیو نەبەردی و زیرەکیەکی کەموێنە.

3. **هۆکارەکانی ڕاگەندن:** هەر هۆکارێکی بەکار هێنراو ئەگرێتەوە لە کەناڵە ئاسمانیەکان یان ڕادیۆو ڕۆژنامەو ئنتر نێت....هتد.
4. **خەڵکی ئاسایی یان سەربازانی دەرەوەی خزمەتی سەربازی:** ئەتوانرێت لە ڕێگەی گوێگرتن لەو سەربازانەی کە تەواوبون لە خزمەتی سەربازی یان دەستیان هەڵگرتووە یان خانە نشین بون زۆر لە زانیاریت دەست بکەوێت ، بەمەش ئەتوانیت تاکەکانی دوژمن بکەیتە جاسوس بەبێ ویستی خۆیان ، وە هەروەها قسەی نێوان خەڵکی ئاسایی کاریگەری زۆری هەیە و ئاماژەی خۆی تیادایە لەگەڵ ئەوەی کە سەرچاوەیەکی لاوازە ، وە باشترین کەسی ئاسایی بۆ دەستخستنی زانیاری ئەو کەسانەن کە تێکەڵاویان لەگەڵ سەربازانی دوژمن هەیە.
5. **هۆکارەکانی پەیوەندی:** بە سەرچاوەیەکی تایبەتو متمانەدار دائەنرێت لە ڕێگەی سیخوڕی کردن لەسەر بێتەلەکانی دوژمن لەڕێگەی ئامێری تایبەت بە چاودێری.
6. **سەرچاوەی جیاوازیتر:**ئەتوانرێت کار گوزار بەجاسوس بکرێت ئەوانەی کە کار دەکەن لە نزیك بارەگاکانی دوژمن بەبێ زانیاریان بەم بابەتە ، چونکە ئەوان زانیاری باشیان هەیە لە سەر ئەوەی کە چی ڕو ئەدات لە لای دوژمن ، وە بەدڵنیاییەوە ئەبێت پرسیارەکانت بەجۆرێکی هەڕەمەکی و پەرتو بڵاو بێت هەتا هەستنەکات بە نیەتت وە بە تەواوی متمانەوە وەڵامت بداتەوە.

**تـــــێبینـــی:**

*ئەگەر تۆ خاوەنی هێزێکی بەهێز بویت ئەوا ئاسانتر ئەتوانیت کاری بەجاسوس کردن بکەیت چونکە بەکرێ گیراوەکانت پشت بە هێزەکەت ئەبەستن وە ئەزانن کەتۆ ئەتوانیت پارێزگاریان لێبکەیت لەکاتی ئاشکرابونیان.

*ئەگەر دوژمنەکەت لەڕوی سەربازیەوە بەهێزتر بوو ئەوا سەختە بە جاسوسکردنی سەربازەکانی یان خەڵکی یاسایی.

*ئەگەر دوژمن لەڕوی تەکنە لۆجیاوە بەهێزتربوو ئەوا سەختە سیخوری کردن لەسەر هۆکارەکانی پەیوەندی کردنی.

*ئەگەر هێزێکی لاواز بویت ئەوا باشترین سەرچاوەی سیخوڕی کردن ئینترنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانە وە بەسیخوڕ کردنی جوتیارو کرێکارەکانی نزیك بنکەکانی دوژمنە یان هێڵە سنوریەکان.

*باشترین هۆکارێ بۆ بە جاسوس کردن خەڵەتاندنە بە پارە چونکە کەم کەس هەیە لە بەردەم پارەو ئافرەتدا خۆی بۆ ڕابگیرێت.

*لەکاتی مامەڵە لەگەڵ ئینتر نێتدا وریابە لەبەر بونی زۆرێك لە زانیاری ناڕاستو خەڵەتێنەر.

*لەخەڵکی ئاسای سەر دێڕ و هێڵە پانەکان وەر بگرە بەڵام لەسەر وتەکانیان هیچ بنیات مەنێ.

*دڵنیابە لە ڕاستی و دروستی زانیاریەکان وە باش بزانە هەر زانیاریەك بەردێکی هەڵچنراوە لە بینا کردنی پلانەکەت بۆیە هەر هەڵەیەك لە زانیاریدا هەڵەیە لە پلاندا و لەوانەیە ببێتە هۆی ڕوخانی کارەکەت.

# مــامــەڵە كــردن لــەگەڵ قەڵا بەندیدا

ڕونە لای هەموان كە دوژمن هەڵئەستیت بە دامەزراندنی هێڵێكی توندی قەڵابەندكراو لەو شوێنەی كە بازگەی تیادا دائەمەزرێنێت ، وە بڕینی ئەم قەڵا بەندیانەش بە دڵنیاییەوە ئامانجێكی ستراتیژی گرنگە ، بەڵام لەڕاستیدا ئاساننیە وە تێپەڕاندنو بڕینی قەڵا بەندیەكان بە پلەی یەكەم پشت ئەبەستێت بە دۆزینەوەی كەلێن لەناویاندا ، وە لەوێوە ئەتوانین دیاری بكەین كە چۆن تێپەڕاندن ئەنجام ئەدەین.

## بەشەكانـــــــی كردەوەی تێپەڕانـــــدنی قەڵا بەندی:

1. **دۆزینەوەی كەلێن:**لە هەر قەڵا بەندیەك هەر چەندیش توندوتۆڵبێت كەلێن بونی هەیە ، وە زانینی ئەو كەلێنانە پشتئەبەستێت بە ڕێژەی زانیاریت بە خودی دوژمن وە ئامێری كاركردنی لە قەڵا بەندیدا و مامەڵە كردنی لەگەڵ قەڵا بەندیدا ، جمو جۆڵی لەپشت قەڵا بەندیەكانیەوە و ڕادەی پارێزگاری كردنی لەو قەڵا بەندیانە وە ناوچەكانی بڵاوبونەوەی ، وە هەروەها گەشتن بەو **كەلێنانە سەرەتای سەركەوتنە لە تێپەڕاندندا** ، وە گەر نەتزانی خاڵی لاوازی دوژمن چیە لە ناو قەڵاكەیدا ئەوا سەركێشی مەكە ، وە هەڵەیەكی گەورەیە گەر هێرش بە شێوازێكی هەڕەمەكی بێت ، وە لاوازی لە زانیاریدا سەبارەت بە قەڵابەندی دوژمن و گۆڕانكاریەكان لەناویدا ، بە هەڕەمەكی كاری تەواو هەژمار ئەكرێت لە هێرشدا.
2. **بەرزی ڕوحی شەڕەنگێزی:** باری دەرونی ڕوخاو ناتوانێ قەڵا بڕی بكات وە ڕێژەی مەترسی لەكردەوەی بڕینی قەڵابەندی كاریگەری ئەبێت لەسەر باری دەرونی جەنگاوەران ، دوژمن ئامادەیە لەناو قەڵادا وە سەربازانی هێرشبەر بەرەو مەرگ ئەڕۆن زیاتر لە ڕزگاربون بەپێچەوانەی بەرگریكار ، بۆیە لەسەر سەركردە پێویستە كە باری دەرونی سەربازان بەرز بكاتەوە.

3. **ئامانج:**پێویستە ئامانج ڕونبێت لە بەرچاوی هێرشبەراندا ، وە دیاریبکرێت بەپێی سروشتی شەڕەکە ، جا لەوانەیە نوێنراوبێت لە دەستگرتن بەسەر قەڵاکەدا یان دەستگرتن بەسەر چەکو عەتادی دوژمن یان تێکشکاندنی هێزەکەی.

4. **پاڵهێزی:** کاتێ هێرش دەست پێئەکات پێویستە چی لەتوانادایە بقۆزرێتەوە ، چونکە زۆربەی کات نەخشە هەر لەدوای لێدانی یەکەمەوە هەڵئەگەڕێتەوە ، وە دەستپێکردن بە هێزەوە خاڵی دووەم دەهێنێتە بون ، وە لەباشترینی بارودۆخەکاندا شەڕکردن لە سەرەتادا توندو دڕە وە هەر خاوە خاویەك واتە بواردان بەدوژمن تا دەست بگرێت بەسەر بارودۆخەکەو هێوری بکاتەوە بۆیە پێویستە کە سەرکردە پارێزگاری لە هاوسەنگی هێرشەکەی بکات دوای ڕوبەڕوبونەوەی یەکەم ، ئەمەش بە گێڕانەوەی پاڵهێزی جارێکیتر بۆ هێرشەکانی تا بتوانێ پێشڕەوی بکات چونکە لە ڕاستیدا هەمو هێرشەکان بە توندی دەستپێئەکات بەڵام پاش ماوەیەکی کەم هێواشئەبێتەوە.

5. **غافڵگیری:** سەرکەوتوی قەڵابڕی بە نهێنی پارێزی ئەبێت هەروەها بە ڕێژەی توانای سەربازان بۆ غافڵگیرکردنی دوژمن ، وەگەر نهێنی پارێزیت لەدەستدا ئەوا غافڵگیرکردنت لەدەستداوە ، وە پێویستە سەرکردەکان توانای گۆڕینی تکتیکەکانیان هەبێت لەکاتی شکست خواردنی نەخشەدا یان بۆ قۆستنەوەی هەلی زیاتر ، ئەگەرپلان نەرمی خۆی لەدەستدا ئەوا زۆرێك لە هەلی هەڵکەوتو لەدەست ئەدەیت ، ئەتوانرێت نەخشە بگۆڕدرێت لەکاتی رون بونەوەی شتێکی ناهاوتا بە مەیدانەکە یان شتێکی لەو باشتر هەیەو لەتوانادایە بەکار بهێنرێت.

***بزانە کەتۆ لە باری هێرشبردندایت وە دوژمنەکەت لەباری بەرگریدایە واتە ئەو زیاتر باڵادەستە بۆیە پێویستە ئاگات لە بەفیرۆدانی زەخیرە و خوێن بێت بەپێی توانا پێویستە ژمارەی پێشڕەوی بە پیادە کەم بکەیتەوە تا ئەوکاتەی دڵنیائەبیت لە لاوازی و بچوکبونەوە و نزیکبونەوەی دوژمن لە کەوتن ، هەرواها پشتبەستن بەپێی توانا بە دورهاوێژەکان ، لەوانەیە زۆری ژمارەی هێرشبەرانی پیادە سەرکەوتوبێت و دوژمن بشکێنێت بەڵام بە خەسارەتێکی زۆرەوە.**

# کـردەوەی تــایبەت

ئەمیش کردەوەیەکی سەربازی جیاجیایە لەڕوی بەکارهێنانەوە ، جێبەجێکارانی ئەم کردەوەیە بریتین لە هێزی تایبەت کە ڕاهێنراون بەشێوەیەکی تایبەتو شایستە دژ بە ئامانج گەلێکی ستراتیژی لەپێناو ئاشکراکردن یان تێکدانی فەرمانەکانی دوژمن کە ئەیەوێت پێی هەڵبستێت.

**بەشـــەکانـی کردەوەی تایبەت:**

1. **ئامانج:** هیچ کردەوەیەك مانای نیە بەبێ بونی ئامانج ئەگەر سەرکەوتوشبێت ، ڕونی ئامانج واتە سەرکەوتویی.
2. **پەیوەندی:** لەگرنگترین ئەو کارانەیە کە هێزی تایبەتی پێ جیا ئەکرێتەوە لەڕوی پەیوەندیەوە بچوکترین هەڵە گیانی تەواوی تاکەکانی هێزی تایبەت ئەخاتە مەترسیەوە وە دورنیە دەستگیر بکرێن یان بکوژرێن ،

**وە پەیوەندی ئەکرێت بە سێ بەشەوە:**

- **پەیوەندی لەڕێی قسەکردنەوە لە ناوچەکانی دور لە دوژمن.**
- **پەیوەندی بە بێتەل لەکاتی نزیکبونەوە لە ناوچەکانی دوژمن.**
- **پەیوەندی بە ئاماژلە ناو ناوچەکانی دوژمن.**

3. **ئامادەکاری:** سەربازی هێزی تایبەت پێویستە هەمیشە لە ڕوی جەستەو تەکنیکەوە ئامادەبێت بۆ هەمو جۆرە کردەوەیەك بەتایبەت ئەو کردەوانەی لە پشت هێڵەکانی دوژمنەوەیە وە هەروەها پێویستە تەواوی پێویستیەکان بۆ هەرکارێك هەڵبژاردە بکات کە گونجاوی ئەو فەرمانەبێت ، وە هەروەها پێویستە توانای ئارام گرتنی هەبێت و بژی لە ناوچە جۆراو جۆرەکان و لە باری نەبونی خواردن و ئاو پێویستیە سەرەتاییەکانیتر ، هەروەها شتێکی باشە کە زمانی دوژمن بزانێتو شارەزای شارستانیەتیان بێت ، هەروەها زانیاری بە زانستی جوگرافیاو تۆبۆ گرافیا**(زانستی بەرزو نزمی و فەلەك و ئاراستەکان)** ، **یاسای ئامادەکاری(ئامادە کردنی سەربازی شیاو بەپێویستی شیاو لە شوێنی شیاو)**

4. **جێبەجێ كردن:** بەتەواوی نهێنی پارێزی و وریاییەوە پێویستە ئەنجامبدرێت ، وە بە كۆبونەوەی گروپەكە و تاوتوێكردنی نەخشەكە بە شێوەیەكی تەواو دەستپێئەكات.
5. **سەرباز:** ئەویش بناغەو پایەی سەرەكیە لە كردەوەی تایباتدا بەبێ سەرباز شتێك نیە بەناوی كردەوەی تایبەت.
6. **نهێنی پارێزی:** كردەوەی تایبەت پێویست ناكات هیچ كەسێك ئاگاداری بێت جگە ئەوانەی پێویستە ئاگاداربن لەپێناو سەلامەتی گیانی سەربازان و پارێزگاری كردن لێیان ،
7. **بونی شارەزای جۆراو جۆر:** پێویستیەكی سەرەكیە بونی شارەزای جۆراوجۆر لەناو هێزی تایبەتدا ، هەروەك بونی گروپی قەناص و گروپی ئەندازیاری و دژە تانك و چەكی سوك(**دەمانچەو AK74-AKM**) وە پێویستە هەموان توانای فریاكەوتنی سەرەتاییان هەبێت و هەروەها شارەزای تەقینەوەو تەقەمەنیەكان و ئەلیكترۆنی....هتد

## خاسیـەتەكانــی كردەوەی تایبەت:

1. خێراو فرێنەرە.
2. ناسراوە بە لێڵی و نادیاری تا دورترین سنور.
3. پێویستی بە سەربازی بەتواناو شایستەیە.
4. كمین بەشێوەیەكی فراوان بەكار ئەهێنن.
5. زۆر جار لە پشت هێڵەكانی دوژمندایە.
6. هیچ هەڵەیەك قبوڵ ناكات.
7. پێویستی بە ڕادەیەكی بەرز هەیە لە شاردنەوە و كۆمۆ فلاش.
8. شایەنی گۆڕانكاریر لەڕوی تكنیكو تەكتیكیەوە.

## (چەند نمونەیەك لەسەرشكست خواردن بەهۆی خراپی لە پلاندا):

### 1. كردەوەی قورقوشمی بەستو:

ئەمەش جەنگێكە جولەكە هەڵیگیرساند دژی كەرتی غەزە وە بووە هۆی كوژرانی هەزارو چوارسەد فەلەستینی.

لە پلانەكەدا جولەكە هەستا كاری سەرلێشێواندنی ئەنجامدا، ڕایان گەیاند كە گوایە دانیشتنی وەزیران ڕۆژی یەك شەممە ئەبێت بۆ خوێندنەوەی هێرشەكە، بەڵام ئەوەبو لەڕۆژی شەممەدا هێرشیان كردوو چەند كیلۆمەترێك پێشڕەویان كرد بەڵام لە كۆتایدا سەرنەكەوتن چونكە..........

- غافڵگیریان لەدەستدا بوهۆی بۆردومان كردن سێ رۆژی تەواو لەسەریەك پێش دەستپێكردنی هێرشی زەمینی پیادە.
- نەبونی زانیاری تەواو لەسەر ناوچەكانی ناوەوە (لەدوای هێڵی ئاگرین)
- نەبونی وردی و ئاگای وچڕكردنەوەی هێرشو خێرای بریاردان

### 2. كردەوەی تیرۆركردنی (ئەنورساادات):

لەڕاستیدا كەسانی ئەنجامدەر گەشتن بەكوشتنی سادات ، بەڵام نەیانتوانی رزگار بن چونكە.....

- هەڵسوكەوت نەكردن لەگەڵ پاسەوانەكان كەبووە هۆی برینداربونی خالدو عەطاء.
- نەبونی نەخشە ی پاشەكشێ و هێڵی پاشەكشێ.

3. **کردەوەی شەمەندەفەرەکانی مدرید:**

یەکێك لە هەڵە هەرە گەورەکان بریتیبوو لە کڕینی موبایلەکانی کەبۆ کارکە بەکاریان هێنا هەمویان لەیەك دوکان وە تەواوی زانیاریەکانی لەسەربوو وە تنها بەئاشکرابونی دانەیەکیان تەواوی ئەنجامدەرانی کردەوەکە ئاشکرابون.

## (چەند نمونەیەك لەسەرسەرکەوتن بەهۆی باشی پلانەوە):

1. **هێرشی ئەڵمان بۆسەرهەریەك لە پۆلنداو فەرەنسا لەجەنگی دووەمی جیهانی:**

- **پۆڵندا:** لەم هێرشەدا ئەڵمان هەستا بە بەکارهێنانی ستراتیژیەتی لەبەرەوە بردن بە بردنی بەشی ڕۆژئاوا بەهێرشێکی خێرا و پاشان ڕێککەوتن لەگەڵ وڵاتانی زلهێز تا بەهۆی ئەم هێرشەوە هێز نەجوڵێنن چونکە پۆڵندا لەوە کەمترە کە خۆیان لەپێناویا بخەنە گێژاوی جەنگەوە.
- **فەرەنسا:** لەبەشی ڕژهەڵاتی باکوری فەرەنسا کە لەسنوری سویسراوە هەتا سنوری بەلجیکا بەتەواوی توندو تۆڵ کرابوو کەناسارابوو بە ، **(هێڵی ماجینۆ)** پاش جەنگی یەکەمی جیهانی ، وە پاش هەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان فەرەنساو ئەلمان ، بەخێرای هاوپەیمانان هێزێکی زۆریان لەو ناوچانە کۆکردەوە وچاوەروانی هێرشی ئەلمان بون لەوێوە و لەبەشی ڕۆژئاواو باکوری سنوری فەرەنسا لەگەڵ بەلجیکا کە هێڵەکەی بۆدرێژ نەبوبووەوە ، بەڵام ئەڵمان بەم جۆرە نەخشەی هێرشەکەی کێشا........

-خۆلادان لە هێلی ماجینۆ پاشان تێپەڕبون بەدارستانی ئاردین

-پاش تێپەڕاندنی دارستانەکە گۆڕینی ئاڕاستە و ڕۆشتن بەرەو دەریا

-بەم جۆرە هاوپەیمانان ئەخەنە ناو دەمی داس.

-بەم جۆرە توانی هاوپەیمانان گەمارۆ بدات.

2. **هێرشی هنیبعل بۆسەرڕۆم:** هنیبعل توانی لەماوەیەکی کورتدا تەواوی ناوچەکانی باکوری ئیتالیا داگیر بکات وەبگاتە نزیك رۆما وەگەر کۆمەڵەی پیران لەقەرتاج یارمەتیان لێنەوەستاندایە ئەوا رۆمای ئەگرت.

**پلانەکە:**

- بڕینی چیای ئالْب کە لەو سەردەمەدا شتێکی ئاستەمبو سوپایەك بەتەواوی پێداویستیەکانیەوە ئەو چیایە ببڕێت.
- بەکارهێنانی دارستان بۆشەڕ لەجێی زەوی تەخت.
- بەکارهێنانی کەمین بۆ لاوازکردنی دوژمن.
- رێككەوتن لەگەڵ هۆزە ئیسپانیەکان.

3. **هەڵمەتی صلاح الدین بۆسەرقودس:** بەچەند هەنگاوێك توانی دەستبگرێت بەسەر قودس.

- لەدیمەشقەوە رۆشت بۆ بوصرە و لەوێ خێوەتی هەڵدا بۆ ماوەیەك،، بەمەش رێی حاجیانی ئاسایشکرد.
- پاشان رۆیشت بەرەو کرك لە بەشی باشوری شام و لەوێوە هێزی مصری بۆیارمەتی پێگەشت.
- ئەم جوڵەیە خاچپەرستانی لەپەرتو بڵاویان ترساند ، بۆیو بەزوی سوپاکانیان لە کەناری دەریای ناوەڕاست کۆکردەوەو خۆیان ئامادەکرد بۆ هێرش.
- صلاح الدین بەخێرای ئەم هەلەی قۆستەوەو ناوچەکانی طبریە و حطینی ئازاد کردو دەستی گرت بەسەر سەرچاوەکانی ئاودا و لەوێدا چاوەڕێی سوپای ماندوی خاچ پەرستی کرد.
- پاش شکاندنی سوپاکە ڕاستەوخۆ هێرشی نەکردە سەر قودس بەڵکو ڕۆشت بەرەو عکا و صیداو بیروت و گرتی بەمەش توانی بەشی رۆژئاوا پاشان باکور کۆنترۆڵ بکات.

- دوای ئەوە ڕۆشت بەرەو بیسان و نابلس و عسقلان و غزە وەدەستی بەسەریان گرت بەم شێوەیە توانی لە هەر چوار لاوە قودس گەمارۆ بدات پاش ئەوە لە عسقلان سوپایەکی کۆکردەوە لە لەتەواوی جیهانی ئیسلامیەوە کۆبوبونەوە بۆ ئازادکردنی قودس و ئازادیکرد.

## سیفەتەکانی پلاندانەری سەربازی:

1. کەسایەتی بەهێز.
2. بوێر لەبڕیاردان.
3. بەکار هێنانی شورا لەسەر هەمو ئاستەکان (زانیاری-بریاردەر-جێبەجێکردن......)
4. ئیمانو باوەر بە ئامانجەکەی.
5. ئامادەبون لە کات و شوێنە ناهەموارەکان.
6. نهێنی پارێزی.
7. هەبونی زانیاری لەسەر تۆبۆگرافیاو جوگرافیا.
8. زانیاری لەسەر زۆرینەی چەکەکان لە سوکو قودس وە زانینی دوری کاریگەر تیایاندا.

# (ســــــتراتــيژی)

**ستراتیژی**:وتەیەکی ئیغریقیەو بەواتا (سەرکردە+مەیدان)دێت وە بەو شتە دەوترێت کە گەشتن پێی واتا گەشتن بەو کلیلەی کە دەرگای ئامانجی پێئەکرێتەوە ، وە ئەبێتە هۆی کورتکردنەوەی رێگا دورەکان.

**ستراتیژیەتی سەربازی:** بەکارهێنانی هەمو تەکتیکە سەربازیە بەردەستەکان بەشێوازێکی گونجاو لەپێناو ئامانجێکی دیاریکراو وەك دەستگرتن بەسەر بەرزاییەك یان رێگای سەرەکی یان قەناتێکی ئاوی یان کارگە گەلێك یان هەر شتێك یان شوێنێکیتر کە مەرجی سراتیژی بونی تیا هاتبێتەدی و بەم ئامانجەش ئەوترێت ئامانجی ستراتیژی.

## پێکهاتوی ستراتیژیەت:

1. ئەو هەڵوێستەی ستراتیژیەت هەوڵی ڕوبەڕو بونەوەی ئەدات یارمەتی ئەدات لە دیاریکردنی ئامانج و ژێرخانی پێویست بۆی.
2. دیاریکردنو ڕێکخستن و پلەبەندی لە ئامانجە قۆناغیەکان یان هۆکاریەکانەوە دەستپێئەکات تا ئەگاتە ئامانجی کۆتایی.
3. ئەو هۆکارو پێویستیانەی کە رێکدەخرێن بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکان ئەبنە هۆی رێگرتن لە پێچەوانکاری و وەپاشان گەورەکردنی تواناکان.
4. نەخشە لاوەکیەکان کە لەڕێگەیەوە یارمەتی ستراتیژیەت ئەدرێت بۆ بە مەتاتی بونی لەڕوبەڕو بونەوەی لەگەڵ ئەو روداوانەی یان ئەو هەنگاوانەی کە لەوانەیە تیایدا بوەستێت ، وە گەرانەوە بۆ ڕۆشتن لەسەر ستراتیژیەتی سەرەکی.

**بەشەکانی ستراتیژیەت:**

1. **لەڕوی پلەبەندیەوە:** نەتەوەی-نیشتمانی-هاوپەیمانی
2. **لەروی سروشتەوە:** کلاسیکی-بەرزتر لەکلاسیکی-زەری
3. **لەڕوی بەکارهێنانەوە:** ڕاستەوخۆ-ناراستەوخۆ-ستراتیژیەتی گشتگیر

**ستراتیژیەتی ڕاستەوخۆ:** لێدانی دوژمن بەشێوەیەکی رووبە ڕوو و هێرشکردنە سەر هێڵەکانی بەرگریو هێرشکردنی بەخێرای وە ئەم جۆرە پێئەچێت لەڕێگەیەوە بتوانرێت دوژمن تێك بشکێنرێت بەڵام تێچونیکی زۆری ئەوێت لەهەمانکاتدا بیرکردنەوەو دارِشتنێکی کەم.

**ستراتیژیەتی ناراستەوخۆ:** جێبەجێ ئەبێت لەڕێگەی برینی هێڵە یارمەتیەکانی دوژمن وە دەوردەدانی لە پشتەوە لەڕێگەی شوێنە پێشبینی نەکراوەکان هەروەك سۆن تزۆ ئەڵێت**(لە رۆژئاوا دەرکەوەو لەرۆژهەڵاتەوە بووەشێنە)** وە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و لەرزاندنی دەرونی سەربازانی دوژمن،

زیاترین کەسێك کەلەم بوارەدا قوڵ بوبێتەوە سۆن تزۆیە کە ئەڵێت**((هیچ شتێک نییە قورستربێت لەجوڵەی زیرەکانە بەجۆرێك کە وابکەیت ڕێگە خوارەکان رێکترین جۆرەکانی ڕێگابن وە (خاڵە لاوازەکان بکەیتە تایبەتمەندی)لەبەرئەمە سوربە لەسەر ڕێگە ناڕاستەوخۆکان وە هەوڵبە ئاگای دوژمن بگوازەرەوە لەڕێگەی سەرقاڵکردنیەوە بە خواردنێکی لاوەکی))**

پاشان خوێندنەوەی بەکارهێنراوە ستراتێژیە نا ڕاستەوخۆکان لەناو هەڵمەتو جەنگە ئیسلامیەکان پێویستە ، بۆنمونە دەستگرتن بەسەر بیرە ئاوەکان لەلایەن موسوڵمانان لە جەنگی بەدردا وە سوربونی پێغەمبەر(صلی الله عیله وسلم) لەسەر نەهاتنە خوارەوەی جەنەنگاوەران لەسەر کێوی( أحد ) وە بەکارهێنانی (مباغـــــته) بۆبەرتەوازەکردنی دوژمن ، وە هەروەها بەکارهێنانی ستراتیژیەتی ناڕاستەوخۆ لەلایەن خـــالدی کـــوڕی وەلـــیدەوە کاتێك لە شەڕی یـرمـــوکدا بەربەستە ئاویەکانی بڕی لە قورسترین شوێنەوە لەکاتێکدا کە دوژمن پێشبینی نەئەکرد کە شتێکی بەو جۆرە ڕوبات.

بەهەمان شێوە لە شەڕی (حطين )دا صـــــلاح الـــدين الايـــوبی سودی وەرگرت لە بنەمای پێچدان لە جوڵەیدا بە پشتبەستن بە ئەسپی خێرا هەروەها فتح کردنی قوستەنتینیا لەلایەن محمد فاتیحەوە بە بەکارهێنانی هێڵێکی دروستکراو لە دار بۆ گواستنەوەی کەشتیەکان بەسەر وشکانیدا بۆ پشتەوەی سوپای دوژمن.

## ستراتیژیەتی ناڕاستەوخۆ دوو جۆرە:

1. **مادی**: هێزی مادی دوژمن بەئامانج ئەگرێت.
2. **دەرونی**: ئاڕاستەی بنکەکانی بیرکردنەوەی دوژمن ئەکرێت بۆ ڕێگرتن لەبیرکردنەوەو پلان دانان.

## جیاوازی نێوان ستراتیژیەتو تەکتیك:

❖ **ستراتیژیەت** بریتیە لە بیرۆکەیەکی گشتی یان زیرەکیەکی گشتی یان ئەو ئامانجەیە کە هەمو جۆرەکانی هێز و تکتیکی تیا بەکاردیت بۆ بەدەستهێنانی.

❖ **تاکتیکیش** ئەو نەخشەو ڕێگەچارە و وردەکاریە بەش بەشە بچوکانەیە کە بەکار دەهێنرێن بۆ هێنانەجێی ئامانجێکی ستراتیژی.

**نمونە:** جەنگی پـــارتـــی زانـی ستراتیژیەتەکەی بەرگریە،بەڵام تەکتیکەکانی هێرشکردنە.

*لەگەڵ چونەپێشەوەی زانستی و تەکنەلۆجیا دوریەکانی هێزو تەکتیکە سەربازیەکان گۆرانکاری بەسەراهات لەروی:

1. **سروشتی چەکەکان**:دەرکەوتنی چەکی (ناوکی) کە زۆر جیاوازە لە چەکە کلاسیکیەکانیتر لەڕوی چۆنیەتەتیو وێران کاریەوە.
2. **کاریگەری زەمەنی**:موشەکە کیشوەر بڕەکان و فڕۆکەکان و گرنگی ئەم کاریگەریە ئەناسێنێت بەهۆی خێرای جێبەجی کردنیانو گەشتنیان بە ئامانج.

3. دیارنەمانی ناوی براوەو دۆڕاوە و دەرکەوتنی شەڕی ساردو بە وەکالەتو و جەنگی سنوردار
4. جەنگ بۆتە کۆتا چارەسەر کە دەوڵەتەکان پەنای بۆ ئەبەن.

## بناغەو پێکهاتوەکانی ستراتیژیەت:

1. ستراتیژیەت توانای پێشکەوتنی هەیە لەبوارەکانی سیاسی و ئابوریو زانستیەوە.
2. سود وەرگرتن لە وانەو دەرسەکانی ڕابردوو وە دانانی لەچوارچێوەی گونجاو لەداهاتوو.
3. بنەمای ستراتیژیەت پێش هەموشتێك پشت ئەبەستێت بە ناسینی کەسی بەرمبەر ، ناسینێکی باشو دیاریکردنی تواناکانی.
4. غافڵگیر کردنی کەسی بەرامبەر لە ڕێگەی هەستان بە چەندکارێکی پێشبینی نەکراو و نەبونی ئامادەکاری بۆ روبەروو بونەوەی لەلایەن دوژمنەوە بۆیە دوژمن بەشێوازێك مامەڵە ئەکات لەگەڵ پێگە ستراتیژیەکان کە لەڕوی کاردانەوەوە بێت نەك لەڕوی لۆژیکو هەڵسەنگاندنەوە ، بەمەش بە نیگیتڤ بەسەریدا ئەشکێتەوە.

# ((کــردەوە گەلـــــی ســـــەربازی))

کردەوە گەلی سەربازی ئەو کۆمەڵە هۆکارەیە کەلە ڕێگەیەوە پلانـــی سەربازی بەجێ دەهێنرێت.

**برگەکانی کردەوەگەلی سەربازی:**

- **هێرش:**
- **بەرگریکردن:**

# هـــــــێـــرش

کردەوەیەکی سەربازیە لەڕێگەیەوە هەوڵی تێکشکاندنی هێڵەکانی بەرگری دوژمن ئەدرێت وە ئەداتێکی بەکارهاتووی گرنگی پلانی سەربازیە.

## کەی هێرش دەست پێئەکات

1. دوای وەستاندنی هێرشی دوژمن و ڕێگرتنی بەکۆمەڵە لێدانێکی پێچەوانە بە ئامانجی هێرشبردن لەناو جەرگەوە.
2. لەکاتی شکست هێنانت لە بەسەرداداني بەرگری دوژمن وە ناچاریت بۆ دوبارە ئامادەکردنەوەی هێرشی سەرلەنوێ.
3. لەکاتی لاوازبونی هێڵەکانی بەرگری دوژمن سۆنتزۆ ئەڵێت **( وەکە ئاوبە کاتێ بەرەڵابوو بەدوای نزمترین ولاوازترین شوێن ئەگەڕێ تا لێوەی بڕوات)**.
4. ئەوکاتەی ئەمانەوێت بەرگری بکەین**(بـاشترین بـــەرگری هـێرش بـردنە)**.

## جـــــۆرەکانی هـــــێرش:

### لەڕی سروشتـەوە:

- **هـــــێـــرشـــی زەمـــینـــی:-**
  1. هێرشی پیادە
  2. هێرش تۆپ هاوێژەکان
  3. هێرشی زرێپۆ(تانك)
- **هـێرشـــــــی ئاســمانـــی:-**
  1. هێرشی فڕۆکەکان
  2. هێرشی موشەکی

- هـــــێــــرشـی دەریایــی:-

1. کەشتیەکان
2. فرۆکە هەڵگرەکان
3. نوقوم بو(غواص)ەکان

## هــێـرش لەروی تــەکتـیکــەوە:-

1. **هەڵکوتانە سەر**
2. **کەمین**

## هــێـرش لەڕوی ئامانجەوە:

1. داگیرکردن ناوچە
2. ترساندن دوژمن
3. شکاندنی بەربەستی ترسی خۆمان
4. وەڕز کردنی دوژمن
5. کوشتنی ژمارەیەك لە دوژمن
6. پاراستنی باری دەرونی جەنگاوەرانمان
7. وەستاندنی هێرشی دوژمن وەرگرتنی کات بۆ ڕێککردنەوەی ڕیزەکانمان.
8. پاراستنی ئابڕوی جەنگی

✓ وە هەرشتێکیتر کە بتوانین لەڕێگەی هێرشەوە پێی بگەین.

## هــــێرش بۆسەر شارەکان

هێرش بۆسەر شارەکان یەکێکە لە سەختترین جۆرەکانی هێرشو ئاڵۆزترینیان هەروەك لەبەشی پێشودا باسمانکرد.

**هەڵسەنگاندن**: دوای دیاریکردنی ئەفسەری بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی هێرشکردن پێویستە شیتەڵێکی تەواو بکرێت بۆ فەرمانەکە.

1. **فەرمان**: شیتەڵی فەرمان هەنگاوی یەکەمە لە کردەوەی هەڵسەنگاندن وە یەکێك لە بەشە گرنگەکانی شیتەڵی فەرمان لە جەنگی شارەکاندا بریتیە لە رونی دیدی پێویست بۆ بەجێبەجێ گەیاندنی فەرمان ، وە پێویستە سەرکردەو نەخشەدانەر ئەم پرسیارانە لەخۆیان بکەن **(ئایەپێویستە هەمو باڵەخانەکان پاکسازی بکەم-ئایە پێویستە پارچەیەکی دیاریکراو پاکسازی بکەم-ئایە پێویستە دەست بگرم بەسەر ناوچەیەکی دیاریکراو-ئایە ئاستی پاراستنی پێویست بۆ هێڵەکانی یارمەتی کامەیەو چەندە)**.
2. **دوژمن**: جەنگی مانۆر ، وردبینی ئەخاتە سەر دوژمن ، وە پێویستە ئامادەکاریە سیخوڕیەکان بەکاربهێنرێت لە شەڕدا بۆ شیتەڵکردنی بارو دۆخی دوژمن و خاکەکەی بە وردی ، سەرکردە بڕیارئەدات ئایە دوژمن نواندنەکەی کلاسیکیە یان نــــــــا.

- **هێزی کلاسیکی**: زۆربەی دوژمنانی پێشبینی کراو شێوازەکانی جەنگییان لەشارەکاندا یان لە خوێندنگا ڕۆژئاواییەکان(**ئەمریکی**) فێربون یان لە ڕۆژهەڵاتیەکان(**سۆڤێت**) وە لەبەر ئەوە دوژمن هێڵی بەرگری دروست ئەکات بۆ ڕوبەڕو بونەوەی لەناوچەی شارەکاندا بەرامبەر هێرش ، وە دورنیە کە ستراتیژیەتی بەرگری لەقوڵاییەوە بەکاربێنێن (**پاشەکشە کردن لە سەرەتاوەو ڕاکێشان تا قوڵاییو پاشان دەوردان و لەناوبردن**) خاڵە بەرگریە ئامادە کراوەکان زۆرجار چواردەورێکی ئامادەکراوی بەهێز و گەورە دروست ئەکەن ، بەڵام کەلێنەکان برگەی جیاکەرەوە پێکدێنن لەو چواردەورە بەرگریە ئامادەکراوەدا ، وە شتێکی پێشبینی کراوە کە دوژمن **کمین** دابنێت لە

کەلێنەکانی چواردەوری بەرگریدا، هەروەها ئەشێت جێگەی بەرگری خەیاڵی دروستبکەن بۆ خەڵەتاندنی هێرشبەر ، وە هەروەها بەرگریکاران هەڵدەستن بەدروستکردنی پێگە بۆ پاراستنی دەرچەو ڕۆچەکان و ڕێگەی ژێرزەمینی تونودتۆڵ وە زۆربەی کات پێگەهەیە بۆ پاراستن هێڵی یەکەم و پێشەوە.




- **هێزی نا کلاسیکـــی** (پارتیزان): شارەکان بونەتە پەناگەی هێزە ناکلاسیکیەکان وە خەڵکە سیڤیلەکە پەنایان ئەدەن وە داپۆشین ئەکەن بۆ کردەوەکانیان وە هێزە ناکلاسیکیەکان بە هەمان شێوە سود لە خەڵکی ناوچەکە وەرئەگرن لە دابینکردنی هێڵی بەرگری شاردا.

3. **بەرزونزمی ڕوی زەوی و کەشو هەوا:**

(1).**زەوی** :پێویستە کردەوەی هێرشبردن بەپێی شێوەو شکڵو جێگەی شاری بەئامانجگیراو دانرابێت بە پشتبەستن بە شیتەڵکردنێکی ورد بۆ خاکەکەی وە زەویەکانیش بریتین لە(**زەوی گرنگ-زەوی چاودێری-هێڵی ئاگرین-زەوی داپۆشین-زەوی شاراوە-بەربەست-نزیککەرەوەکان**).

(2).**کەشو هەوا** : لە هەمو کردەوەیەکی سەربازیدا کەشو هەوا کاریگەری خۆی هەیە لەسەر پێداویستیەکانو زەویو وراەدی بینین ، بەڵام بەڕێژەیەکی زۆرتر کاریگەری لەسەر سەرباز دەبێت (**بەفر-باران-سەهۆڵبەندان-تەپوتۆز-بـــــا-تەڕەشوع-پلەی گەرمای بەرز**) هەمو ئەمانە بەڕێژەی جیاواز لەتوانای مرۆڤ کەمدەکەنەوە.

4. **هێزو یارمـەتی بەردەست و ئامادە**: پێویستە سەرکردە زانیاری تەواوی هەبێت بە هێزەکەی لە هەمو ڕویەکەوە(**جۆرەکانی ڕێکخستنی چەکەکان ئەوانەی بەردەستەلای وەژمارە و توانای هێزەکەی**) لەکاتی کارکردن لەسەر شیتەڵکردنی کردەوەی هێرش بۆسەر ناوچەی باڵەخانەی، لە قۆناغی پلاندانانی سەرەتایدا ، پێویستە پێوانەی قەبارەی هێز بکرێت بە قەبارای شارەکە و هێزی دوژمن و فەرمانی دیاریکراو دیاری بکرێت.
5. **کاتی پێویست**: پێویستە بڕوانیتە ئەم پرسانەی لای خوارەوە لەکاتی پێوانەکردنی کاتی پێویست بۆ هێرشکردنە سەر شارەکان:

- شەری ناو جادەو بانو ماڵەکان و گەڕەکو کۆڵانو پارچە باڵەخانەییەکان کاتێکی زۆری پێویستە.
- هێزی پیادە بەشێوەیەکی خێرا توشی ماندوبون ئەبێت لەکاتی پێکدادانو پاکسازیدا بەهۆی شڵەژانو بەفیڕۆدانی توانای لەش بەشێوەیەکی زۆر.
- پێویستە کاتی پێویست دابین بکرێت بۆ پلاندانان و بەرچاوگیری و پێداچونەوەی گشتی.

## هەنگاوەکانی هێرشکردن:

هێرشکردن یان پەلەکردنێکی (بەهەڵپە)یە یان خێرابونێکی خوێندنەوە بۆ کراوە، هەردوو شێوازەکە پێویستە تێیدا سود وەربگیرێت بەپێی توانا لە نەخشەو بەرچاوگیریو هەماهەنگی بەجۆرێك یارمەتیدەربێت لەڕوی بوارو کاتەوە ، بە چاوپۆشیکردن لە قەبارەی هێزی هێرشبەر یان دابینکردنی پێویست بۆ ئامانج ، هەنگاوەکانی هێرشەش بریتین لە( **بەرچاوگیری-تەراکردن(جیاکردنەوە)-دابینکردنی جێپێ-دەستگرتن بەسەر ئامانجدا**).

**(1) . هیرشی خوێندنەوە بۆ کراو**: ئەمیش جۆرێکە لە جۆرەکانی هێرش بە بەکارهێنانی هەما هەنگی لە نێوان هێزی هاوێشتنی ئاگرو جوڵە جیائەکرێتەوە ، کە پێشتر خوێندنەوەی بۆ کراوە بۆ نزیکبونەوە لە دوژمن و پاشان تێکشکاندو دەستگیر کردنی بەدڵنیاییەوە ئەمە کردەوەیەکی هەماهەنگی کاریە بە تەواوی ، ئەم جۆرە هێرشە کاتێ بەکاردێت کە جێگەی دوژمن توندو قەڵابەندبێت یان کاتێك شار گەورەبێت یان چڕو پڕ بێت وە هێرشی خوێندنەوە بۆکراویش بەسەر ئەم بەشانەی لای خوارەوەدا دابەشدەبێت:

- **قۆناغی یەکـــەم: بەرچاوگیری ئامانج**: کۆکردنەوەی زانیاریو بەرچاوگیری و چاودێری کردنی توند لە کردەوەی پلاندانانو نەخشەکێشیدا سەرەکی و بنچینەییە بۆ سەرکەوتن وە پێویستە تەواوی توانا سیخوڕیەکانت بەکاربهێنیت بۆ دەستخستنی زانیاری ڕاستەوخۆو ڕاست لەسەر دوژمن وە پێویستە ئەفسەر بەشداربێت لە کۆکردنەوەی زانیاری و بەرچاوگیری بەشێواەیەکی ڕاستەوخۆ وە هەروەها بەرچاوگیری بەردەوام پێویستە بۆ پەرەپێدان لە پلاندا بەپێی گۆڕانکاریەکان (نزیککەرەوەکان و هێڵەکانی یارمەتی و ئەنزیمەکانی چەکو تەقەمەنیەکانی دوژمن و شوێنی جێگیرکردنی ئەو ئەنزیمانە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆکانیان) هەمو ئەمانە نمونەی ئەو زانیاریەن کە دەبێت کۆبکرێنەوە.
- **قـۆناغـی دووەم: تەراکردن(گەمارۆ)ی ئامانج**: ئەتوانرێت ئامانج تەرا بکرێت لەڕێگەی دەستگرتن بەسەر هەندێ ڕوگەی سروشتی یان سازکراو کە بەرزو ڕوانەرن بەسەر ناوچەکەدا وە ئەتوانرێت بەهەمانشێوە تەراکردن

ئەنجامبدرێت لەڕێگەی هەما هەنگی ئاگر(تەقە)ی هێزی پاڵپشت بۆ داخستنی هێڵە یارمەتیەکانی دوژمن.



- **قـۆناغی سێـەم: دابینکردنی جێ پی:**

دوابەدوای جیاکردنەوەو تەراکردنی ئامانج بەخێرای پێویستە جێپێ دابین بکرێت بە وپەڕی خێرای لەکاتدا چەند بتوانرێت لەبەر پاراستنی بەردەوامی هێرشەکە، وە دەستگرتن بەسەر جێپێدا بەردەوامی هێرشەکە دابین ئەکات تا ئەگاتە شوێنی ئامانج ، وە ئەم هێرشەش ئاگری بێدەنگکەر پشتگیری دەکات ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و دوکەڵی ، سریەیەك هەڵئەستێت بە هاویشتنی ئاگری بێدەنگکەر و سریەیەکی تر هەڵئەستێت بە دەستگرتن بەسەر جێپێدا.

- **قۆناغـــی چـــوارەم: دەستگرتن بـەسەرئامانجدا:**

تەنها بەدەستگرتن بەسەر جێپێدا و بەهێزکردنی هێزی پاڵپشتی ئەگوازرێتەوە بۆ ناو ناوچەی باڵەخانەی لەپێناو یارمەتیدان بۆ داگیرکردنی ئامانج ، بۆ پارێزگاریکردن لە

بەردەوامی هێرش پێویستە گواستنەوە لە قۆناغەکاندا دوا بەدوابێت بە کۆتا هاتنی قۆناغێك قۆناغی دوای ئەو دەستپێبکات وە پێویستە **فشاری بەردەوام (الزخم)ی** بەکارهاتو کارابێت. پێویستە هێزی هێرشبەر ئامانجەکانی خۆی دیاری بکات بۆ دڵنیابون لەوەی کە ئەو هێزە ناکەوێتە هەڵەوە بەدرێژای میحوەرەکە ، کەلێنەکان لەوانەیە هەل بداتە دوژمن بۆ دزەکردن بەدرێژای هێڵی پێشڕەوی یان وا لە هێزی تەرای هاوڕێ بکات کە مەترسی هێرشکرانە سەری هەبێت.




وە هەروەها ئەم قۆناغە تێیدا ناوچەی جێ پێ توندوتۆڵ ئەکرێت وە ڕێخستنەوەی ڕێزەکانو ئامادەکاری بۆ کردەوەکانی داهاتو ئەنجام ئەدرێت، لە ڕێگەی دانانی ئامانجگەلێکی سنوردار و بەرگریدانان دژی هێرشی هەڵگەڕاوەی دوژمن لەگەڵ پارەزگاری لە هێزی بەردەوام**(فشار)** ، پاش دابینکردنو دیاریکردنی ئامانجە سنوردارەکان ئۆتۆماتیکی ناوچە ئازادکراوەکان دابەشئەکرێت بۆ چەند پارچەیەك بۆ پاکسازی ورد تیایدا ، وە دەستبالای بەپێشڕەوی ئەبێت لەخانو بۆ خانویەکیتر وە لە کۆلانێك بۆ کۆڵنێکیتر لە ناوچەی کردەودا بە گشتی ، لەوانەیە پێشڕەوی خێرا خۆی بنوێنێت لە پێشڕەویکردن لە ناوچەیەکی لاواز لەڕوی قەلابەندیەوە بۆ دەستگرتن لەڕێیەوە بەسەر ئامانج ، (هەڵبژاردن لەنێوان هەردوو شێواز لەلایەن ئەفسەرەکان لەسەر بنەما خوازراوەکانی(فەرمان و شیتەڵکردن))ئەبێت.

دەستگرتن بەسەر ئامانجدا لە بەرزو نزمیەکانی شاردا پلانێکی ورد و هەماهەنگ ئەخوازێت و بەهەمان شێوەش سەرکردایەتیو دەستبەسەراگرتن نا بنکەیبێت ، لەلایەن یەکینە بچوکەکانەوە ئەنجامبدرێت ، دەست بەسەرا گرتن تەواوکەری هێرشە بۆ تەواوکردنی داواکراوەکانی هێرش.

1) **پێشڕەوی خێرا بەرەو ئامانجێکی مەترسیدار**: ئەتوانرێ پێشڕەوی خێرا بەکاربهێنرێت بۆ پاراستنی **بەردەوام هێزی (فشار)** لە جوڵەدا لەناو ناوچەی کاردا و دەستگرتن بەسەر ئامانجە سەرەکیەکان ، هەروەها لەوانەیە ناچاربیت هەندێ ناوچە تەرا بکەیت یان بەجێیبهێڵیت بۆ پارێزگاریکردن لە بەردەوامی کار.




پێشڕەویکردن بەرەو ئامانجـــێکی گرنگو مەترسیدار

2) **پاکسازی گشتی**: بریتیە لە لەناوبردنی ڕیشەی تەواویی پێگەکانی دوژمن لە تەواوی ناوچەی ئامانجدا ، لەکاتێکدا بەکاردێ کە کات تێیدا کارتێکەرێکی بڕێنەرەوە نەبێت.




(2). **هێرشــی بەپەلــە**: هێرشی بەپەلە لە کردەوە زەمینیەکاندا بریتیە لەو هێرشەی کە تێیدا کاتی پێویست بۆ ئامادەکاری ئەکرێتە قوربانی لە بەرامبەردا خێرای ، سودی لێوەرئەگیرێت بۆ قۆستنەوەی هەل ،زۆر کات هێرشی پەلە بەکار ئەهێنرێت لە ئانجامی دروستبونی هێڵی ئاگرین چاوەڕوان نەکراو لەگەڵ دوژمن لە کاتی گواستنەوەدا لە ناو ناوچەی باڵەخانەیدا یان کاتی هەڵکەوتنی هەل ، بۆ قۆستنەوەی . هێرشی پەلە بە **4** قۆناغ ئەنجام ئەدریت هەروەك هێرشی خوێندنەوە بۆکراو ، وە لەگەڵئەمەشدا پەستان ئەخرێتە سەر کات لەنێوان ئامەدە سازیو جێبەجێ کردندا.

a) **فەرمانە جـەنگیەکان**: هەمو ئەو کاردانەوانە ئەگرێتەوە کە لەناو مەیدانی شەدا ڕوئەدات و ئەنجام ئەدرێت ، پلاندانەران خوێندنەوە ئەکەن بۆ فەرمانە جەنگیەکان و یەکیان ئەخەن لەکاتی شیتەڵکردندا باشترین ڕێگەکان بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەرکی سەرشان هەڵئەبژێرن، هەروەها فەرمانە جەنگیەکان هەمو مانۆڕ و جوڵە زیرەکانەکان ئەگرێتەوە لەگەڵ سیخوڕی و یارمەتیە لۆجستیەکان و سەرکردایەتی و دەستبەسەراگرتن و پاراستنی هێز.

b) **سەرکردایەتی و دەستبەسەراگرتن**: خودی سەرکردە پێویستە جێگیربێت لە باشترین جێگە لەڕوی چاودێریو کاریگەری لە شەڕەکەدا ، جێگەکانی جێگیربون بەپێی پلەبەندی سەرکردایەتی دادەنرێت. بۆ نمونە سەرکردەی مەفرەزەکان لەجێگەیەك جێگیر ئەبێت کە بتوانێت چاودێری و ئاڕاستەی مەفرەزەکان و ئاگر هاوێژیان و ناوچەکانی کە پێیان سپێردراوە بکات ، لەکاتێکدا سەرکردەی کتیبە لە جێگەیەك جێگیر ئەبێت کە بتوانێت ئاڕاستەو چاودێری سریەکان بکات ، شەڕکردنی نزیك لە دەورو پشتی باڵەخانەکان وا ئەکات کەبەڕێوە بردن و دەستبەسەراگرت تاڕدەیەکی زۆر سەختبێت ، لە شەڕی نزیکدا لەوانەیە سەرکردەکان پەنا ببەنە بەر نێردراوان بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ یەکینەکانیان و سەرکردایەتی باڵا ، وە هەروەها جێبەجێکردنی سەرکردایەتی و دەستبەسەراگرتن لەڕێی 3 ئاستەوە دەبێت.

- **تەکتیکی**: یارمەتی سەرکردایەتی ئەدات بۆ قابیلیەتی بەردەوامبونی پاڵپشتی کردەوەکان لەگەڵ ئازادی لە جوڵەدا وە دەبینرێتەوە لە جێگەکاکانی توانای سەرەکیدا لە کاتی ڕوداوە گرینگەکان ، وە تەرکیز ئەخاتە سەر شەڕی نزیك.
- **سەرکردایەتی سەرەکی**: پاڵپشتی کردە کاراکان و پلاندارشتن بۆ کردەوەکانی داهاتو و دابین کردنی پەیوەندی بەردەوام لەگەڵ سەرکردایەتی باڵا
- **سەرکردایەتی پشتەوە**: بۆ یارمەتیدانی کردەوەکانی دواوە(پشتگیری لۆجستی) و بەردەوامیدان بە کردەوەکاری

c) **سیـــــخوڕی**: کۆکردنەوەی زانیاری سیخوڕی لە شاردا کارێکی سەختە چونکە باڵەخانەکان داپۆشەرنو شاردنەوە دابین ئەکەن لە بەردەم فرۆکەی سیخوڕی و سەربازانی بەرچاوگیری و مانگە دەستکردەکان.

- **زانیاریە پێویستەکان**: لەگەڵ زانیاری لەسەر شوێنی جێگیربونی یەکینەکانی دوژمن وە سروشتی بەرزو نزمی و قابیلیەتی تێپەڕاندنو ڕۆشتن بە ڕێگەکان وە زانیاری تری لەم جۆرە کە پێویستە کۆبکرێنەوە ، جەنگی شارەکان پێویستە ئەمزانیاریانەی لای خوارەوەی تیا کۆبکرێتەوە:

1) چڕی دانیشتوان و تایبەت مەندیەکان و شارستانیەتیان.
2) شوێنو چۆنیەتی ڕێگرو گەیەنەرە ئاویەکان.
3) پانتایو شێوازی ڕێگەو شەقامەکان.
4) نەخشەی تۆڕی ڕێگەکان.
5) شوێن و پانتاییو توانای هەڵگری پردەکان.
6) نەخشەی تۆڕەکانی ژێرزەوی(میترۆ-ئاوەڕۆ-تونێلەکان....هتد).
7) جۆرو شێوازو سروشتی باڵەخانەکان.
8) جێگەی سەرەکیەکانی پەیوەندی.

- **کۆکردنەوە**: زانیاری وردو ڕاست و دروست لە کاتی پێویستدا کارێکی گرنگە بۆ سەرکەوتنی هەر کردەوەیەکی جەنگی شارەکان ، لەوانەیە زانیاری کۆکراوە دەربارەی گۆڕانکاریە تازەکانبێت کە لەسەر ڕیگەی گەیاندنی یارمەتیەکان کراوە یان گواستنەوە یان گۆڕانکاریە سیاسیەکان لەنێوان لایەنە جیاوازەکان ، ئەم زانیاریانە پێویستە ئیستەیی بن و پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر ڕاستیەتی بکرێت وە تازەگەری تیایدا بکرێ چەندێك هێزی هێرشبەر بەرەوپێش بڕوات لەناو شاردا.
- **نەخشە**: پێویستە نەخشە تەکتیکیەکان بەنەخشەی ڕێگەوبانەکان تەواو بکرێن ئەوانەی کە ناوی ڕێگەکانو و زانیاری لەسەر جێگەی باڵەخانە گرنگەکان و کەناڵەکانی گواستنەوەکانیان تێدایە ، وە پێویستە نەخشەکان دابەشبکرێن بەسەر تەواوی یەکینەکاندا لەناوشارەکە.

d) **جوڵەی زیرەکانە(مانۆڕ)**: ئەمیش زیادکردنی هێزە لە مەیدانی شەڕەکەدا لە ناو شارەکە لەڕێگەی جوڵەکردن و ئاگر.

*پێویستە هەر بەشێکی ئازادکراو بەتەواوی پاکسازی تیابکرێت وەهەروەها دوبارە ڕێکخستنەوەی ڕیزەکان ئەنجامبدرێت وە ڕێگەنادرێت بەدوژمن بمێنێتەوە لەهیچ بەشێکی دەستگیربودا.

*ئەو ناوچانەی کە داگیر ناکرێن و جێئەمێنێن ، پێویستە لوغمی تیادا بڵاوبکرێتەوە لەگەڵ بەر ئاگرخستنو وێرانکردنی هەروەها پێویستە یارمەتی بگەیەنرێت بەناوچە دەستگیر بووەکان بە دامەزراندنی ڕێگرو لوغمڕێژی.....هتد وە هەروەها پێویستە ڕێگەی باش بگیرێتە بەر بۆ بەردەوامبونی یارمەتی بە هەمو جۆرەکانیەوە(مادەی خۆراکی و زەخیرە و مادەی هەندەسەی...هتد)

*بەرپەچدانەوەی دوژمن زیادئەکات بەپێی زیادبونی پێشڕەوی لەناو شاردا لەبەر ئەمە پێویستە یەکینەکانی ڕیزی پێشەوە پارێزگاری لە پاڵنەری جەنگیان بکەن وە شەڕ بە چەسپاوی و هەڵمەتەوە بکەن تا دەگەنە ئامانج.

*پێویستە دەست بەسەر ئەو یەکینانەدا بگیرێت کە لەسەر ئاڕاستەی جیاواز کاردەکەن چونکە لەوانەیە بگەنە قۆناغێك تێیدا نزیك بـبنەوە لەیەکتر بەڕادەیەك ئەشێ تێکەڵاوبن و ڕوبەڕوی یەك ببنەوە.

## ڕێکخستنەوەی ڕیزەکان جارێکیتر:

1. گرنگیدان بەکاری برینارو کوژراوەکان.
2. گرینگیدان بە دیلو بەڵگەنامە دەستکەوتوەکان و گواستنەوەی ئامێرو غنیمەتەکان.....هتد.
3. دەستگرتن بەسەر خەڵکی سیڤیل لەناو شاردا(باش مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکی سیڤیل یارمەتی کۆتایهێنان بە بەرپەچدانەوەی نهێنی دەدات ، وە هەروەها ئەتوانرێت سود لە کەسانی پلەبەرزو ناسراو لەناو شاردا وەربگیرێت بۆ قەناعەتکردن بە خەڵکی سیڤیل لەپێناو پاراستنی ئارامیو جوڵە نەکردن).
4. پاراستنی شوێنە گشتیەکانو دەزگا حکومیەکان لە تێکدان.
5. ڕێکخستنی باری هاتوچۆ.

## یاساکانــی هێرشکردنە سەرشارەکان:

### یاسا تکتیکــیەکان:

1. خێرای لە پێشڕەویکردن لەژێر داپۆشەری ئاگرین یان پێشگر یان جوڵەی زیگزاگ یان ئاگرو جوڵە ، پێویستە جێ گۆڕکێکان خێرابێت بۆ گەشتن بە بەربەست و خۆدانە پاڵی بۆ پاراستن لە ئاگری دوژمن.
2. لەکاتێکا کە دوژمن بەهێزبو پێویستە پێچ بدەیت لە قەڵا بەندیەکانی و دەستی بەسەرا بگریت.
3. تێکشکاندنی پێگەکانی دوژمن پێش هەڵکوتانە سەر شار.
4. دورکەوەرەوە لە ڕوبەڕیونەوەی ئەو سەربازانەی دوژمن کە ڕائەکەن لە شەڕ.
5. لە باری ڕوبەڕو بونەوەی و توشبونی ڕێگرێك یان ڕوداوێکی نەخوازراو پێویستە پاشەکشە بکرێت وە پلانرێژی بکرێت بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو ڕێگرەدا و پاشان هێررش دوبارە ئەنجامبدرێت.
6. بەفیڕۆ نەدانی زەخیرەو و چەك بەپێی توانا.
7. هێوریو بێدەنگی و دەرنەکردنی دەنگ لەکاتی جێبەجێ کردندا.
8. پێچدان لە ناوچە لاوازەکانەوە دەبێت.
9. نەجوڵان بەتەنهاو پەرتەوازە نەبون لەکاتی پێشڕەویو پاکسازیدا.

### هێزی بەشداریکەرلەهێرش:

1. پاڵپشتی کە بریتیە لە(**گروپی چاودێری-گروپی تێکشکێنەر-گروپی بریی یارمەتیەکان-گروپی ئاماژە**).
2. کۆمەڵی هەڵکوتان(اقتحام) پێکدێت لـــــە:(**ئەندازیاری(ئەلکترۆنی و تەقەمەنی)-پاڵپشتی لاوەکی-هەڵکوتانو پاکسازی**).
3. کۆمەڵی یەدەگ بۆ پشودانی گروپەکانیتر و هەڵگرتنەوەی سەرکەوتن لە چەند بەشێکی دیاریکراو و یارمەتیدانی گروپەکان لە ڕاکێشانی دەستکەوتەکان و هێنانەوەی بریندارو کوژراوەکان و بردنی دیلەکان.

## تـــــێ هەڵـــــکـــــــــوتان *الاغارە*

تێهەڵکوتان کردەوەیەکە کە بەهێرشبردن بۆسەر هێزەکانی دوژمن دەکرێت وە جۆرو سروشتەکەشی بەپێی ئامانج و پێویستیەکان ئەگۆڕێت(هێزی پیادە-تۆپهاوێژ-فڕۆکە) وە ئەمەش کردەوەیەکی هێرشی تەواوە.

- **پایەکانی تێ هەڵکوتان:**

1. **رونی ئامانج:**نارونی ئامانج واتە بەرزبونەوەی رێژەی شکستهێنان.
2. **کۆکردنەوەی زانیاری:** پێویستە لە زانیاریەکاندا هیچ هەڵەیەك نەبێت چونکە هەڵەی یەکەم هەڵەی کۆتاییە وە پێویستی بەزانیاری باش هەیەو وەزانیاریەکانیش پێویستیان بە تازەکردنەوەی بەردەوامە چونکە سەرباز لەیەك باردا ناوەستێت.
3. **پێویستی:** پێویستیەکان بەپێی کردەکان و شوێنەکان ئەگۆڕێن هەیانە پێویستی بە زەمینیەو هەیانە پێویستی بە ئاسمانیەو هەشیانە پێویستی بە دەریاییە.
4. **جێبەجێ کردن:** بە دەرچون دەست پێئەکات و توند ئەبێ بەهێرشو وە کۆتای دێت بە پاشەکشە وە جێبەجێ کردن لەسەر بنەمای پلانێکی توندو تۆڵ دادەنرێت لەگەڵ بونی پلانی جێگرەوەکان کەپلانی پاشەکشەش و هێرشە یەدەگەکان لەخۆ بگرێت.
5. **پاشەکشە:** سەرکەوتن بە **عاقیبەت خێری ئەبێت** بۆیە تێ هەڵکوتان سەرکەوتو نابێت هەتا تەواوی سەربازان نەگەڕێنەوە بەسەلامەتی ، هەر لەبەر ئەماش پێویستە کە سەربازان دەست بە هێرش نەکەن هەتاکو دڵنیا ئەبن لەوەی چۆنو کەیو لە کوێوە بگەڕێنەوەو پاشەکشە بکەن.

## ■ مەبەست لە جێبەجێ کردنی تێ هەڵکوتان(الاغارە):

1. کوشتنی تاکەکانی دوژمن.
2. تێکدانی بنکەکانی دوژمن.
3. گرتی بەڵگەنامە کەیس.
4. ئازادکردنی گیراوەکانمان.
5. دەست بەسەراگرتنی بنکەکانی دوژمن.
6. پەرتەوازەکردنی دیدی دوژمن.
7. گرتنی دیل لە دوژمن.
8. ڕاکێشانی دوژمن بەرەو شوێنی خواستراو.

*جێبەجێکردنی تێ هەڵکوتان زوربەی کات لەسەر ئامانجێکی تەنیاو تار ئەبێت وەکو ئەو پڵنگە ی کە بەدوای ئەوئاسکە ئەکەوێت کە جیائەبێتەوە لە مێگەلەکەی یان هەوڵی ئەوە ئەدات جیای بکاتەوە.

*پێویستە بزانیت کە ئامانجە سەربازیەکان لەژێر چاودێریو پاراستنێکی تونددان ، لەبەر ئەوە هەڵکوتانە سەریان کارێکی سەخت ئەبێت بەکۆمەڵێك کەسی ڕانەهێنراو بەشێوەیەکی باش ، وە پێویستیشە ئەم کردەوەیە لە چوارچێوەی جەنگی پارتیزانی ڕێکو دروستدابێت بە ڕێکخستن و دور لە ئاڵۆزی.

## ئەو زانیاریانەی کە ئەفسەرپێویستە لەکاتی تێ هەڵکوتاندا بیزانێت:

1. ئامانجی تێ هەڵکوتان و پلەکەی ، جائەگەر سەرەکیبێت یان لاوەکی.
2. بونی زانیاری لەسەر توندو تۆڵیەکانو قەڵا بەندی و ڕەبایەکانو و هەمو ئەلغامەکانی کە لەچواردەوری جێگەی تێ هەڵکوتانەکەدا هەیە.
3. چاودێری کردنی پرۆگرامی پاسەوانی ناو بازگەکانی دوژمن وە ئاگابون لە هێماکانی شەوانەیان وە پرۆجیکتۆرە ئاشکراکەرەکان ئەگەر بونی هەبو.

4. زانیاری لەسەر ئەو چەکانەی کەلەناو بازگەکەیا هەیەو وە گرنگیدان بە چەکی زرێ پۆش چونکە هەڵکوتانە سەر بازگەی زرێ پۆشەکان جیاوازترە لە هەڵکوتان بۆ سەر بازگەی پیادەکان.
5. زانیاری بە ڕێگەکانی پەیوەندی تەلیو بێ تەل بەپێی توانا ، وە دابینکردنی تەشویشی پێچەوانە.
6. زانینی دەوریەکان نێوان بازگەی بەئامانج گیراوو بازگە نیزیکەکانیتری دوژمن لێیەوە بۆ زیاتر ئاگاداربون و هەڵوێست وەرگرتن لێیان وە دانانی پلان لەسەر بنەمای هاوکاری وەرگرتن و جێگرەوەی دوژمن و لەگەڵ هەژمارکردنی پێچوی کاتی(فاصل الزمنی).
7. زانیاری بون بە دەوریەکانی دوژمن و هێڵی کارکردنیان وە بزانە ترسناکترین دەوریە لەسەر تێ هەڵکوتان دەوریەکانی پیادەیە کە توانای تێپەڕاندنو پێچدانیان هەیە.
8. خوێندنەوەو زانینی ڕێگەکانی گەشتن بە ئامانج(سەرەکیو لاوەکیەکان) وە دیاری کردنی لەسەر نەخشە.
9. بونی زانیاری لەسەر رێگە بەکارهاتوە جەنگیەکانی دوژمن بۆ درك پێکردنی کارەکانی و رەددانەوەی گونجاو بۆی.
10 . زانینی خاڵی لاوازو بەهێزی دوژمن.

***بەجێهێنانی غافڵ گیری لەڕێی ئەمانەی لای خوارەوە دێتەجێ:**

1. کۆمۆ فلاش(تمویە)**شاردنەوەو خۆ گونجاندن** بەباشی.
2. دیاریکردنی ڕێگەچارەی گونجاو بۆ نزیکبونەوە.
3. دیاریکردنی کاتی شیاو بۆ هێرشکردن
4. داهێنان لە فێڵو (تمویە) کۆمۆ فلاش.
5. دیاری کردنی ڕێگەی جیاواز و پێشبینی نەکراو لە جێبەجێ کردن.

*پێویستە ڕاهێنان لەسەی پلانی دانراو بکرێت پێش جێبەجێکردن.

## جۆرەکانی تێ هەڵکوتان:

1. **لەڕوی کاتەوە**:شەویو ڕۆژی
2. **لەڕوی شێوازەو**:بێدەنگ و ئاشکرا
3. **لەڕوی کردەوەوە**: اقتحام ، تەقەی دور
4. **لەڕوی پێویستیەوە**: پیادە ، بە بەکارهێنانی ئامێرەکانی گواستنەوە .

## گروپەکانی تێ هەڵ کوتان(الاغارە):

1. **گروپی پاراستن**: فەرمانەکەی ئاسایش کردنی پێشڕەوی و هێرش کردن و پاشەکشەیەی گروپەکانی ترە ، وە کاری گروپی پاراستن

- چاودێری کردنی ڕێگاکان و دابینکردنی ئاسایش بۆ هێزی تێ هەڵکوت.
- ئاسایش کردنی شوێنی جێگیر بونی هێزی پاڵپشت.
- گەمارۆدانی بازگە و دانانی چەکی قەناسەکەی لەسەر خاڵە هەستیارەکانی دوژمن لە بازگەکەیدا بۆ پاراستنی هێزی **(اقتحام)**لەناو بازگەکەدا لەکاتی هێرش کردن و پاشەکشە.
- کاری داپۆشین: بڕینی یارمەتیەکانی دوژمن هیلاککردنی بازگەکە.

*چەکەکانی ئەم گروپەش بریتیە لە چەکی سوك وەك کلاشین کۆف قەناصە و ڕەشاشی مام ناوەند وە موشەك و نارنجۆکو لوغم و جۆرەکانی بۆمبو تەقەمەنی.

2. **گروپی پاڵپش(الاسناد)ی دور**: فەرمانەکەی بۆردومان کردنی قەڵابەندیەکانی دوژمن و پاك سازی کردن بۆ هێرش وە داپۆشەری پاشە کشێی هێزەکان لە تێ هەڵکوتانی ئاشکرا و ئاسایش کردنی هێزی هێرش بردن وە یارمەتیان ئەدات لە حاڵی ئاشکرابونیاندا وە هەروەها یارمەتی گروپی پاراستن ئەدات لە پچڕاندنی هێڵە یارمەتیەکانی دوژمن وە هەروەها چەکەکانیان بریتیە لە چەکی مامناوەند و چەکی قورس (موشەك یان تۆپ هاوێژ)

3. **گروپی جێبەجێ کردن**: فەرمانەکەی جێ بەجێ کردنی کردەوەکەیە وە چەکەکانی بریتیە لە چەکی سوکو تەقەمەنی و نارنجۆك و پەتو گوریس و چەقۆ و بێدەنگکەر(کاتم صوت) ، وە ئەتوانین بیکەین بە دوو بەشەوە(سەرەکی و یەدەگ) گەر گروپی سەرەکی توشی ماندوی یان زیان بوو ئەوا کار بە یەدەگ ئەکەین وە هەروەها ئەتوانین بەکاری بهێنین بۆ خەڵەتاندنی دوژمن و سەر لێشێواندنی بە هێرش کردنی گروپی یەدەگ لە لایەکی دیکەوە بۆ گۆرینی دیدی دوژمن لەسەر هێرشە سەرەکیەکە یان بۆ پاڵپشتی نزیك.

## قۆناغەکانی تێ هەڵ کوتان:

- **قۆماغی دیاری کردن**:ئەمیش بە چەند ڕێگایەك ئەکرێت.

1. دیاریکردنی ئامانج
2. کۆکردنەوەی زانیاری
3. دیاریکردنی شێوازی جێبەجێ کردنی گونجاو
4. هەڵسەنگاندنو هەڵوێستەکردن و دانانی نەخشەیەکی گشت گیر لەسەر بنەمای یاسا سەربازیەکان.

*پێویستە لەسەر ئەفسەر کە خوێندنەوەی هەبێت بۆ تواناکان و هێزی سەربازیو چەکیو جەنگی دوژمن و ڕێژەی ئامادە باشی ئەو ، هەروەك پێویستە بە هەمان شێوە سروشتی ئەو زەویە هەڵسەنگێنێت کە تێ هەڵکوتانەکەی تیا جێبەجێ ئەکرێت ، پاشان پێویستە هێزی گونجاو پێویست دیاری بکات بۆ کارەکە.

*بنەمای تەکتیکی سەربازی لە پلانی سەربازیدا بریتیە لە(**غافڵ گیری-پەرتکردن(عزل)-چڕکردنەوەی ئاگر-دەست بەسەراگرتن**) وە بە جێبەجێ کردنی ئەم کارە ئەتوانێت ئەو یاسایە پوچ بکاتەوە کە ئەڵێت(بۆ هەر بەرگری کارێك سێ هێرشبەر پێویستە).

- **قۆناغی ئامادەبون**: ئامادە کردنی تەواوی پێویستیەکان لەچەکو عەتاد وە ئەم ئامادە کاریەش کاری جێگری ئەفسەرە.
- **قۆناغی دڵنیای کردنەوە**:پێویستە تیایدا دڵنیای بکەیتەوە لەوەی کە تەواوی سەربازەکان لەڕوی تواناوە ئامادەن وە هەمویان بەتەواوی تێگەشتون چی ئەکەن وە ڕۆڵیان چیە ، وە دڵنیا بون لە باری دەرونی سەربازان وە دڵنیابون لە شاراوەی و کۆمۆ فلاشی سەربازان و چەکەکان ، وە دڵنیابون لە ئامادە باشی چەکداران بۆ دەرچون ، و پاشان ڕاهێنان لەسەر شوێنێك کەهاوشێوەی شوێنی کردەوەکە بێت.
- **قۆناغی کۆبونەوە**: پێویستە شوێنی کۆبونەوە چەند مەرجێکی تیابێت:

1. پێویستە ناوچەکە داپۆشراوبێت بە درەخت وە بمان پارێزێت لە چاودێری زەمینیو ئاسمانی دوژمن.
2. پێویستە فراوان بێت هەتاکو یارمەتی بڵاو بونەوەی تەواوی سەربازەکان بدات لەکاتی پێویست.
3. کۆمەڵێك گردی گرنگی لەچواردەوربێت بۆ پاراستنی وە ئاسایش کردنی چاودێری دور هەتا نەتواندرێت دزەمان بەسەردا بکرێت.
4. لەدەرەوەی سنوری چەکە بەهێزە قورسەکان بێت.

- **قۆناغی دەرچون و مسیر**:لەرێی ئەو میحوەرەی کە ڕێکەوتوین لەسەری.

تایبەت مەندیەکانی میحوەری مەسیر:-

- ✓ توانای چاودێریت دەداتێ لەسەر تەواوی ڕێگاکە لە پێشەوەو لاکان.
- ✓ گرێدراوبێت بە چەند میحوەرێکی لاوەکی ترەوە بۆ دابین کردنی جوڵە یان گۆڕینی میحوەری سەرەکی لەکاتی پێویستدا.
- ✓ دانیشتوانی تیانەبێت.
- ✓ داپۆشراوبێت بەشێوازێکی سروشتی.

## ئەو یاسایانەی کە پێویستە لەکاتی مسیرا جێبەجێ بکرێت:

1. هێڵی مەسیر و خاڵەکانی کۆبونەوە و پشوو هەروەها ڕێگەکانی ڕۆشتنو گەڕانەوە و ڕێگە یەدەگو لاوەکیە کان پێوێستە زانراو بن لای تەواوی سەربازان.
2. شێوازی پێکهاتەی مەسیر دیاری ئەکرێت بەپێی شێوازی زەویەکە لەڕوی سروشتو بەرز و نزمیەوە.
3. بەکارهێنانی زەوی بەدانای و جوڵە بە چەکەوە بە شێوازێکی راستو دروست.
4. پێویستە تەواوی سەربازەکان لەژێر دەستی سەرکردەیابن.
5. پێش گەشتن بە ئامانج بە ماوەیەکی گونجاو کە دوربێت لە بەئامانج گیرانی لەلایەن چەکی سوکی دوژمنەوە ، پێویستە گروپەکە جێگیر ببێت وە بازنەیەکی بەرگری ڕێك بخات وە ئەو ناوچەیەش ناو ئەبرێت بە ناوچەی ڕێکخستن.
6. پێشڕەوی دوسەربازی چاودێری بەرەو بازگەکانی دوژمن بۆ چاوەدێری کردنی جوڵەیان وە هەروەها دڵنیابون لە نەگۆران یان ئاشکرا نەبونیان لەلایەن دوژمنەوە وە بەمە دەوترێت چاوەدێری کۆتایی.

- **قۆناغی هێڵی ڕێکخستن:** ئەو هێڵەیە کە سەرکردە تیایدا کۆتای بە مسیر دێنێت تا دەستبکات بە دابەشکردن و بڵاو کردنەوەی یەکینەکان **(الوحدات)** ی تێ هەڵ کوتان **(الاغارە)** هەروەك لەسەرەتاوە باسمان کرد ، پاسەوانی و پاڵپشتیو ئیقتیحام.

*هێڵی ڕێك خستن پێویستە لەبەر ئامانج گیری دوژمن نەبێتو داپۆشەری سروشتی و کۆمەڵە خاڵێکی تیابێت کە بروانێت بەسەر ناوچەی ئامانج وە شوێنی دزەکردنی تیابێت.

- **قۆناغی هێڵی پاراستن:** هێڵی داخستن نزیکەی 150م دورە لە گروپەکانی ئقتیحامەوە ئەم هێڵە لەم هەنگاوەدا هەڵئەستێت بە ئاسایش کردنی چونەناوەوەی ئەو گروپانە.

- **قۆناغی کارکردن لەسەرئامانج:**پاش لێدان و جیاکردنەوەی ئامانج و کردنەوەی کەلێن لە ناو بەرگری ئامانج وە کوشتنی پاسەوانەکان ، سەرکردە هەڵدەستێ بە هاوەڵایەتی گروپی ئیقتیحام و جێگرەکەشی لەگەڵ گروپی پاڵپشتیا ئەبێت ، پێویستە لەگەڵ پێشڕەویا بە تەواوی ورياييەوە هەمو گروپەکان لەشوێنە تازەکان جێگیر بکرێن بەشێوازێکی گونجاو ، پێویستە پەلە نەکرێت لە هەڵنانی هەنگاوەکان تاکو نەبێتە هۆی شکست ئەگەر پاڵپشتی دور هەبوو ، وە ئەگەر پاڵپشتی دور نەبو ئەوا گرو پی ڕێگر هەڵئەستێ بەبڕینی یارمەتیەکانی دوژمن وە ئامانج جیا ئەکاتەوە لەکاتی پێویست پاشان گروپی ئیقتیحام دەست بە جوڵە ئەکات.

*گروی ئیقتیحام پێشڕەویەکەی سەرەتا بە سەربازانێك دەست پێئەکات پێان ئەوترێت **(کـــەلێن دروستکـــەرەکان)** ڕێگە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان ئەکەنەوە.

*ئەکرێ ئەو کەلێن تێکەرانە چند قەناس بەدەستێکبن ڕێ بۆ ئیقتیحامیەکان بکەنەوە بەیارمەتی چەن سەربازێکی زیرەکو شارەزا و خاوەن توانا و ئەزمونێکی بەرز لە تێ هەڵ کوتانی بێدەنگدا زیاتر پێویستە.

- پاشان باقی گروپ لەو شوێنانەوە پێشرەوی دەکات کە کەلێنی تێکەوتووە وە سەرکردە لەگەڵ ئیقتیحامیەکان هاوڕێی ئەکات و جێگرەکەشی لەگەڵ پاڵپشتی و پاراستن

- پێویستە کار بکرێت لەسەر بێدەنگ کردنو لێدانی جێگا هەستیارەکان لەسەرەتای هێرشدا.

- لە تێهەڵ کوتانی ئاشکرادا پێویستە ئاگر بارانێکی چڕ بکرێت لەکاتی ئیقتیحام لەپێناو نەهێشتنی هێزی دەرونی دوژمن وە ڕێگرتنی لە بەکارهێنانی چەکەکانیو جێبەجێ کردنی غافڵ گیری.

- پاش دەست بەسەراگرتنی شوێنو بازگەکانی دوژمن گروپێك هەڵدەستێت بە بەدوا گەڕانی ونبو بریندااران دیلەکان و زانیاریە دەستکەوتووەکان و کۆکردنەوەی غەنیمەتو تێکشکاندنی هەرشتێك کەتوانای گواستنەوەی نییە.

- پێویستە کردەوەی ئیقتیحام لە چەند خولەکێکدا تەواوبێت بەتایبەت لەکاتێکدا کە دوژمن بەهێزتربوو.

- پاش تەواو بونی فەرمانەکان سەرکرە فەرمان ئەکات بە پاشەکشە ، بەخێرای گروپی ئیقتیحام هەڵئەستێ بە پاشەکشێ لەژێر چاودێری گروپی کەلێنکەر و تەقەی گروپەکانی پاڵپشتی و پاراستن وە لەو شوێنانەوە کەئیقتیحامی کردووە پاشەکشێ ئەکات وە پاشان گروپی کەلێن دروستکەر هەڵئەستێت بەداخستنی هەمو ئەو کەلێنانەی کە کردویتییەوە ، وە لەکۆتای دا تەواوی گروپەکان پاشەکشێ ئەکەن بەرەو خاڵی کۆبونەوە.

*خــــاڵی کـــــۆبـــونـــەوە:ئەو ناوچەیەیە کە پاشتەواوبونی تێ هەڵکوتان تەواوی گروپەکان تیایدا کۆئەبنەوە بەمەبەستی لێکۆڵینەوەی زیانو دەستکەوتەکان و پیاداچونەوەی حسابەکانو دوبارە ڕێکخستنەوەی ڕیزەکان ،ئەمە لەکاتێکدا کە ژمارەی سەربازان کەم بون ، بەڵام لەکاتی ژمارە زۆریدا پێویستە هەر گروپەو خاڵێکی کۆبونەوەی خۆی هەبێت ، پێویستە خاڵی کۆبونەوە زانراوبێت لای تەواوی سەربازان.

*پێویستە لە تێهەڵ کوتانی بێ دەنگدا غافڵ گیری بەئەنجام بگات لەڕێگەی کوشتنی بێدەنگی پاسەوانەکان ئەمەش ئەکرێ لەڕێگەی چەند سەربازێکی ڕاهێنراو بەشێوەیەکی چرو بەهێز لەسەر شەڕی نزیك و هونەری جەنگی سپی وە پێویستە خاوەن دەماغێکی ئاسنین بن لەگەڵ لاشەیەکی بەتاڵ هەروەها گروپی کەلێن دروستکەر هەڵئەستێ بەدانانی نیشانە لەو کەلێنانەی کە دروستیان ئەکات یان دانانی پاسەوان لەسەریان.

*تێ هەڵکوتانی بێدەنگ پشت بەچەن شێوازێکی تایبەت ئەبەستێ لەوانە بەکارهێنانی حەبل بۆ دابەزین و سەرکەوتن لەشوێنە بەرزەکان ، وە زانیاری تیۆریو پراکتیکی لەسەر کردنەوەی بۆمبو لوغم.

*لە حاڵەتی بونی لوغمدا گروپی هەندەسە دەوری گروپی کەلێن دروستکەر دەبینێت لەکردنەوەی ڕێگاکان.

**ئەوکارانەی پێویستە ئەنجام بدرێت لە خاڵی کۆبونەوە:**

1. چارەسەرکردنی سەرەتای بریندارەکان.
2. دڵنیابوون لە ونبووەکان.
3. دابەش کردنی غەنیمەکان.

**مەرجەکانی خاڵی کۆبونەوە:**

1. پێویستە توندوتۆڵبێت بەسروشتی وە دوربێت لەو شوێنانەی کە پێشبینی کراوە.
2. پێویستە**800-1000**م دوربێت لە ئامانجەوە.
3. ئەتوانرێت زیاتر لە خاڵێك دیاری بکرێت وە باشتر وایە لە شوێنە سەختەکاندابێت.
4. پێویستە بە خێرای خاڵی کۆبونەوە بەجێ بمێنێت.

*پێویستە چەند سەربازێك بمێننەوە لەخاڵی کۆبونەوەدا بۆ چاوەڕوانی دواکەوتووەکان ئەمە لەحاڵی جەنگی **(ڕێکخراو)**یان نیمچە ڕێکخراو بەڵام لە جەنگی پارتیزانی پێویستە هەر بەزوی هەرکەسەو بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی.

*پاش تەواوبونی کردەوەکەو گەڕانەوە بۆ خاڵی کۆتای پێویستە ڕەچەتە**(تقرير)**ێك بنوسرێ لەلایەن بەرپرسی کردەوەکەوە بۆ وەرگرتنی عیبرەت و دوبارە نەکردنەوەی هەڵەکان.

**کارەکانی سەرکەوتنی تێ هەڵکوتان:-**

1. پاش گرتنی تەواوی هۆکارەکانی سەرکەوتن پشتبەستن بەخوای گەورە وە پاککردنەوەی نیەتەکان لەهەمو ئارەزویەکی ناپەسەند.
2. زانیاری پێویست و تازە لەسەر ئامانج پێش و دواو لەکاتی جێبەجێ کردن.
3. دیاریکردنی کات و شێوازی گونجاو.
4. گونجاوی چەکەکان لەگەڵ هێزی دوژمن و توندو تۆڵی و قەڵا بەندیەکانی.
5. فەرمانداری سەربازانو ڕێکخستنی ئاگر و تەقە.
6. شیاوی سەربازان و ئەزموندارین و ڕێك خراویان لەناو یەکتر.
7. نەخشەیەکی مەحکەم.
8. خێرای لە جێبەجێ کردن و پاشەکشەو خۆشاردنەوە.
9. هەڵمەت بردن و توندو تۆڵی.
10. چنینەوەی سەرکەوتن.

# Assault (الاقتحام)

هێرشی ڕاستەوخۆیە لەسەر ئامانجێکی دیاریکراو بۆ هێنانەدی مەبەستێکی دیاری کراو وە ئەمەش تایبەتە بە سەربازانی پیادە وە بە بەشێکی سەرەکی دائەنرێت لە هەمو جۆرە جەنگێکدا.

**بنەماکانی (الاقتحام):**

1. دیریکردنی و ڕونی ئامانج
2. کۆکردنەوەی زانیاری(پێویستە نەخشەکێشی اقتحام لەهەموشتێك هەمو شت بزانێت)
3. پێویستی گونجاو(دیاریکردنی پێویستی گونجاو لەبارودۆخی گونجاو وە لە شوێنی گونجاو وە کاتی گونجاو)
4. شایستەیی (ئازایەتی بەتەنها بەواتای شایستەی نایات هەروەك چۆن زانیاری بێ ئازایەتی لە بریاردان سودی نیە)
5. فشاری بەردەوام(الزخم) ؛ (بەردەوامی لە لێدان سەرکەوتو نابێت ئەگەر غافڵ گیری(المفاجئە)ی لەگەڵدا نەبێت.
6. غافڵ گیری کاتی و غافڵ گیری شوێنی: جیاکەرەوەی سەرکەوتنو شکست خواردن غافڵ گیریە.
7. کات : ئەو شتە نەبینراوەیە کە شتە بینراوەکان ئاماژەی بۆ ئەکەن بەهۆی کاریگەری لەسەریان ، وە ئەکرێت بە سێ بەشەوە:
   - فەلەکی: بریتیە لە شەوو ڕۆژ
   - مەداری: چوار وەرزەی ساڵ
   - جوڵۆك: ئەو کاتەیە کە دوژمن تیایدا لە ئامادە باشیدایە یان غافڵە.

*لەنێوان ئەم کاتانەدا پەیوەندی هەیە بۆنمونە کاتی زستان دوای گزنگ**(فجر)** بەگشتی کاتی **غەفڵەتە** ، وە لە هاویندا دوای **نیوەڕۆ** کاتی یاری و **(اللهو)**ە وە کاتی بەهار سەرەتای شەو کاتی ئامادە باشیە.

8. خۆشاردنەوە(التخفی): لەوانەیە جێ بە جێ بکرێت لە ڕێگەی بەخێرای ڕۆشتن بەرەو دوژمن یان لەڕێی کۆمۆفلاش(تمویە)ەوە.
9. خێرایو وردی:پێویستە لەسەرت جومگەکانی دوژمن لێك جیا بکەیتەوە پێشئەوەی هەست بکات چی روئەدات ، لە زۆربەی کردەوە سەربازیەکاندا پێویستە بە کاوخۆ بیر بکەیتەوە و بە خێرای جێبەجێ بکەیت ، بەڵام لە اقتحامدا پێویستە بەخێرای بیر بکرێتەوەو بەخێرای جێبەجێ بکرێت.
10 . دزە کردن(التسلل): سەرکەوتن لە دزەکردندا واتە هێنانەجێی غافڵ گیری وە بونی غافڵ گیری واتە سەرکەوتن لە هێرشدا.

*اقتحام پێویستی بەکۆمەڵێکی سەربازی ڕاهێنراو هەیە بەشێوەیەکی باش وە ئامادە باشبێن بۆ جێبەجی کردن لەهەمو کاتێکدا ، چونکە مەیدانی ڕاستی وەکو مەیدانی ڕاهێنان نیە.

*ئەوەی اقتحام جیا ئەکاتەوە لە کردەوەکانیتر ئەوەیە کە تێکرژانی ڕاستەوخۆی تیایە لەگەڵ دوژمن.

## جۆرەکانی ڕێخۆش کردنی اقتحام:

1. ڕێخۆشکردن بە تۆپ هاوێژ
2. رێ خۆشکردن لەرێگەی هێرشی ئاسمانیەوە
3. لەرێگەی دزە کردن(التسلل)ەوە لە حاڵی اقتحامی بێدەنگدا

## جۆرەکانی ئیقتیحام لەروی جێگەوە

- **ئــیـقـتـیـحامی خــانو**

ئەوەی خانو جیائەکاتەوە لە جێگەکانیتر و ئقتیحام کردنیان ئەوەیە کە پێکهاتووەکەی ژورو پلیکانەو قات قات و زۆرشتی ئەندازەیتر وەتێیدا زۆربەی هێزەکان بچوک دەبێتەوە لە چەکی سوك هەروەها مەوداکان نزێك دەبنەوە لەزۆربەی کاتدا بەجۆرێك جەنگ ئەبێتە جەنگی **پیاو بەرامبەر پیاو**.

پێویستە بزانین لە هەمو کارەکانماندا**(ئەوەی پێویستنیە ئەوا پێویستنیە!!!)**بۆیە گەر بتوانین بە هێرشێکیدی کاری ئقتیحام ئەنجام بدەین وەك هێرشی تۆپ هاوێژ یان ئاسمانی یان موشەکی ئەوا پێویستناکات گیانی سەربازان بکەینە مەترسیەوە.

**لەکاتی ئیقتیحامی خانودا پێویستە ئەم کارانە بکەین:**

- دیاریکردنی **ئامانجێکی** رون لای سەرکردەو سەربازان.
- **کۆکردنەوەی زانیاری**: گرنگترین بەشە لە بەشەکانی ئقتیحام وە باش بزانە کە هەر کێشەیەك لە زانیاریە وەرگیراوەکاندا بونی هەبێت ئەوا شکست مسۆگەرە.

*لە پلان داناندا پێویستە هەمو شتێك لەسەر هەمو شتێك بزانیت.

- پێویستە هۆکارەکان گونجاوبن لەروی هێزو ژمارەو کاتو شوێن.

*بەکارنەهێنانی نارنجۆکی پارچەهاوێژ لە جێگایەك کە پارچەکان توانای بڕینی دیوارەکانی هەبێت.

*وەکو پێشتر باسمان کرد بۆ هەر بەرگریەك دوو هێرشبەر هەیە بەڵام گەر بە تکنیکی باشەوە رو بەڕو ببینەوە ئەوا یەك هێرشبەر توانای لەناو بردنی دوو بەرگریکاری ئەبێت.

- شایستەی(**الكفاءة**): شایستەی لەسەریەتی کە جێبەجێکردن پۆزەتف بکات وەشایستەی پێویستە لە سەرباز و ئەفسەردا بونیان هەبێت.
- کات:باشترین کات بۆ ئیقتیحام ئەو کاتەیە کە دوژمن لە غەفڵەتو بێ ئاگایدایە یان لەکاتی خڵەفاویدایە(یاری کردن-کات بەسەر بردن-عەرەق خواردنەوە-نان خواردن-بێزاری-مەلە کردن-زینا کردن......هتد)وە زوربەی کات غەفڵەت لە دوای گزنگەوەیە وە خڵەفاویش لەدوای عەسرەوەیە.

- **خۆشاردنەوەو دزە کردن(التسلل)**:لە دزە کردندا بەرەو خانو ئەمانەی لای خوارەوە پەیرەو ئەکرێت:

- ✓ پاراستنی شاراوەیی تا کۆتای کردەوەکە.
- ✓ وریایی لە راڕە دەرەکیەکان ، ڕێگەیەك بگرە دوژمن بیری بۆی نەڕوات وەك(کونی زێراب-تونێلی ژێر زەمینی-کون کردنی دیوار-بەکارهێنانی ئاژەڵی بچوك و ناردنی بۆ مەمەرەکان-بەکارهێنانی فرۆکەی چاوەدێری بچوك-وە هەرشتێکی دیکە کە پێشبینی نەکراوبێت یان دوژمن بێدەسەلاتبێ لە بەرامبەری).
- ✓ نەڕۆشتن بە بەر پەنجەرەدا بەتایبەتی ئەوەی کە پەردە یان بەتانی پێوە نراوە زۆرجار لەژێر چاوەدێری قەناصدایە یان داوی پێوە کراوە.
- ✓ لەکاتی دزە کردندا دورکەوە لەهەر شتێك کە دەنگ دەرئەخات.
- ✓ بەکارنەهێنانی عەتر لە کاتی دزە کردن.
- ✓ بەکارهێنانی ئاماژە(**ئیشارەت**) بۆ پەیوەندی نزیك وە بۆ دور بێتەل یان مۆبایل ئەگەر بەردەست بوو بەڵام پێویستە سەماعە پێوەبێت)
- ✓ لەش سوکیو تواناو جوڵەی خێراو زیرەکیو دانایی پێویستە لەکاتی دزە کردن)
- ✓ ئامادەباشی بۆ پاشەکشێ لە هەمو بارێکدا.

- **غافڵ گیری کاتو شوێن**:ئەگەر سەربازان توانیان بە تەواوی ئەنجامی دزەکردنئەنجامبدەن ئەوا سەرکەوتو ئەبن لە هێنانەدی غافڵ گیری.

-**پایەکانی غافڵ گیری**:

1.فشاری بەردەوام(الزخم):پێویستە دوژمن غافڵ گیر بکەیت بە بەردەوام فشارکردن لە لێدانیدا بەجۆرێك بواری بۆ نەڕەخسێت تا بیربکاتەوە چی بکات

2.وردی و خێرایی:خێرای بەرپرسە لە هێنانەدی فشاری بەردەوام و وردیش بەرپرسە لە ئفلیج کردنی جوڵەی دوژمن.

*__تێبینیەکانی ئیقتیحامی خانو__:

- دوجۆر خانومان هەیە (سادەو ئاڵۆز)ئەوەی کە خانوی سادە جیائەکاتەوە لە ئاڵۆز ئەوەیە کە قات قات نیەو پلیکانەی تیانیە.
- هێرش بۆسەر خانو پێویستە چەند دوریەك وەربگرێت.
- هێرش بردن لە پشتەوە باشترە لە هێرش بردن لە پێشەوە بۆ پێدانی هەل بەدوژمن تا هەڵبێت.
- شوێنی هێرشەکەت دیاری بکە پێش دەستکردن بە جوڵە.
- ڕێخستن و هەماهەنگی پێویستە پێش دەستپێکردن هەروەك چۆن پێویستە دوای دەستپێکردن.
- هەر ساتێك بەفیڕۆ بدەیت دوژمن ئەیقۆزێتەوە.
- ئیقتیحام ناکرێت هەتا تەواوی یەکینەکان ئامادە نەبن(پاڵپشتی-پاراستن-ئیقتیحام)
- هەر هەنگاوێك هەڵی ئەنێیت پێویستە لە خۆت بپرسی بۆ؟

*ئیقتیحامی خانوی ئاڵۆز لەم شتانەدا لە خانوی سادە جیاوازە(زۆری ژور-بونی چەند تەبەقێك-بونی پەیژەو پلیکانە-زۆری دەرچەو هۆدەو درگاو پەنجەرە-باڵا دەستی دوژمن زیاترە-توندو تۆڵترە)

*لەکاتی ئیقتیحامی خانوی ئاڵۆزدا باشتروایە لە بەشی سەرەوە بچیتە ناوەوە چونکە ڕۆشتن لە بەشی خۆرەوە پێویستی بە بەکارهێنانی هێزێکی زیاترە وە هەروەها

بەکارهێنانی بەشی سەرەوە رێگە دەدات بە دوژمن تاکو هەڵبێت وە شەڕی مانو نەمان نەکات.

## چۆن مامەڵە لەگەڵ ژورەکاندا ئەکەیت:

- ✓ لەکاتی ئیقتیحامی خانوێکدا کە ژوری زۆری تیابێت پێویستە یەك بەدوای یەك ژورەکان ببڕدرێت وە نابێت هیچ ژورێك بەجێ بهێڵیت بەبێ دڵنیابون لەوەی تیایەتی.
- ✓ نابێت دەسکی دەرگاکان بەکار بهێنیت بۆ کردنەوە ، هەروەها بەکارهێنانی پەنجەرەو بۆ چونە ژورەوە لەپێناو دورکەوتنەوە لە تەڵەو داو بەمەرجێك دڵنیابیت لەوەی کە داو لەوێشدا دانەنراوە.
- ✓ نابێت بڕۆیتە هیچ ژورێکی داخراو تا درگاکەی نەتەقێنیتەوە بە لوغمێك یان چەسپ کردنی نارنجۆکێکی دەستی پێوەی.
- ✓ نابێت  بەهیچ جۆرێك پلاکی کارەبایی بەکار بهێنیت تاکو دڵنیا نەبیت لەوەی کەنەکراوە بە تەڵە
- ✓ ئەگەر ژورێکی بۆمب ڕژکراو دۆزرایەوە ئەوا پێویستە بەخێرایی گروپی هەندەسە ئاگاداربکرێتەوەلێی وەگەرنا پێویستە نیشانە بکرێت تاوەکو لەدوایدا بچنەوە سەری یان گروپی دووەم مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.
- ✓ هەر ژورێك پاککرایەوە نیشانە ئەکرێت بەنیشانەیەکی تایبەت تاوەکو گروپی ئیقتیحام نەگەڕێتەوە سەری جارێکیتر.

## ▪ ئـــــقـــــتــــيـحامی بازگه:

لەگەڵ ئیقتیحامی خانودا جیاوازە لەم بەشانەی خوارەوەدا.

- زۆری ژمارەی چەکداران.
- فراوانی ڕوبەرەکەی.
- بونی توندو تۆڵیە سەربازیەکانو قەڵا بەندیەکانی چواردەور بازگە.
- زۆری چەك تیایدا.
- زۆری دەرچەی چونە ناو هاتنەدەر.
- سەربازی زیاتری ئەوێت بۆ هێرشکردنە سەری.

*زۆری ژمارەی سەربازان کێشەنیە چونکە فەرمانی ئیقتیحامیەکان مامەڵەکردننیە لەگەك خەڵکی سیڤیل(مدنی) ، وە چارەسەری فراوانی ڕوبەرەکەشی بە دەستگرتن ئەبێت بە سەر شوێنکی بەرز وەك(بورجی پاسەوانی) یان گردو بانێك.....هتد.

*زۆری ژمارەی سەربازەکانت توانای دابەشکردنی ئازاددت ئەداتێ بێئەوەی لە کەمو کوڕی بترسیت.

*دەستگرن بەسەر دەرکەکانی چونەژورەوەو هاتنە دەرەوە لەگرنگترین کارەکانە لەجێبەجێکردنی هێرش بۆسەر بازگەدا.

*لە سەرەوە دابەزین و ئقتیحام بۆناو بازگە کارێکی هەڵەیە بەڵکو چەنێك ئەتوانیت سود لە تەکنیکی گەمارۆدان وەربگریت.

**ئیقتیحامی بازگە دوو ئامانجی هەیە لە زوربەی کاتدا:**

☒ **داگیردردن:**پشت ئەبەستێت بە هێرشی غافڵگیرو بەردەوام بەبێ وەستان و توندی لە لێدانەکاندا وە خێرای تیایدابنچینەیە.

☒ **زیان گەیاندن بە دوژمن:** ئەمیش زیاتر لە جەنگی پارتی زانیدا بەکاردێت وە وەسف ئەکرێت بە شاراوەی و نهێنی کاری تەواو پشت ئەبەستێ بەمبدەئی لێدانو هەڵهاتن.

*لەکاتی گەمارۆدرانت لەناو بازگەدا ئەوا پێویستە لەسەرت خۆت بەباشی بشاریتەوە وە فێڵکردن وە تەرکیزکردنی لێدانەکان لەسەر یەك لا و لەگەڵ ئاگاداربون لە لایەکانیتر.

*پێویستە سەربازان بەپێی دەرچەکانی چونە ناوەوە هاتنادەرەوە دابەش بکرێن.

- **ئـــقتـــیحامـــی زیندان:**

کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر زیندان لەرێگەی (زیندانیە ئازاد بووەکان یان کارەگوزارەکانی ناو زیندان یان لە خەڵکی چواردەوری زیندان یان ئەوانەی هەستاون بە سەردانی زیندانیکراوەکان).

**ئەوزانیاریانەی کە پێویستە کۆبکرێتەوە لەسەرزیندان:**

- وێنەی کرۆکی ناوچەکە:
- وێنەی کرۆکی ناوەوەی زیندانەکە**(ژوری ئەفسەران-ژوری سەرکردە-چێشتخانە-........هتد)**
- پرۆگرامی پاسەوانی ناو زیندانەکە.
- رێگاکانی ئەگات بە زیندانەکەو کامەیان دوژمن بەکاری ئەهێنێت بەشێوەیەکی سەرەکی.
- باشترین رێگە بۆ نزیکبونەوە ی هێزەکانمان ئەو شوێنانەیە کە ساتری سروشتی یان دەستکردی تیایە.

*پێویستە زیندانیان بزانن کە بەردانیان نزیکە هەتاکو نەبێتە شتێکی لەپڕتاو بۆیان و نەتوانن مامەڵەی لەگەڵ بکەن.

## ئەو شتانەی کە پێویستە ڕەچاو بکرێت لە ئیقتیحامی زینداندا:

- ڕچاوکردنی ئاستەمترین کار کە پاشەکشێە.
- کارکردن بە گروپێکی بچوك.
- مامەڵەکردن لەگەڵ کەمینە لەپڕتاوەکان.

*ڕاهێنان لەسەر نەخەوتن ماوەی 48کاتژمێر بەبێ نانو ئاو.

## پێکهاتەی زیندان:

- دیواری بەردینی دەرەکی و دیواری ناوەکی و بورجەکانی پاسەوانی کە تەنها سەربازێکی تیایە.
- دەرگای سەرەکی وە لەوانەیە دەرگای لاوەکیشی تیابێت.
- شوێنی مانەوەی بەندکراوان.
- شوێنی هێزی سەرەکی ناو زیندان.
- وەرشەو چێشتخانە و هەڵگرە میکانیکیەکان و هێزی سەرەکی پاسەوانی.

*هیچ قفڵێك نیە کردنەوەی نەبێت وە کوشتنی بێدەنگ پێویستە بۆ پاسەوانانی ناو بورجەکان.

*باشترین کات بۆ لێدان کۆتایی ڕۆژوو سەرەتای شەوە چونکە لەو کاتەدا ڕێگەو بان تێکەڵو چڕە و کەس بەکەسە وە ئاستەمە لەسەر دوژمن شوێن کەوتنت و گەڕان وە هەرکاتێکیتر دوژمن پێشبینی نەکات.

*کاتژمێر 2 تاکو گزنگ پشکنین ئاسانە لەلایەن دوژمنەوە وە بەدڵنیاییشەوە بەڕۆژدا توانای ئەوەی هەیە ڕاتگرێت.

## زانیاریە پێویستەکان بۆ دیاریکردنی چۆنێتیو چەندێتی ئیقتیحامی زیندان:

- کاتی مانەوەو گۆڕینی پاسەوانی.
- شوێنەکانی پاسەوانی.
- ڕفتاری تاك بە تاکی پاسەوانەکان.
- ڕێژەی پەیوەستبونی پاسەوانەکان بە ئەرکەکانیانەوە.
- کەشو هەوای ناخۆش لای پاسەوانان.
- جۆری ئەو چەکەی کە پێیانە.
- بارو دۆخی دانیشتوانی ناوچەکە **(لەگەڵ-دژ-بێ لایەن)**
- باری ناوچەکە لە هەمو ڕویەکەوە وە کاتەکانی ئیزدیحام و ئاڵۆزی تیایدا.

*پێویستە جێبەجێ کردن بە هەنگاو هەنگاوبێت وە هەژماری کاتی پێویست بکرێت بۆ هەر هەنگاوێك.

## گروپەکان ئقتیحامی زیندان:

- **گروپی چاوەدێری** : فەرمانەکەیان کۆکردنەوەی زانیاریو چاوەدێریکردنی گۆرانکاریەکانە کەروودەدەن.
- **گروپی ئامادەکاریو گواستنەوە:** ئەرکیان گواستنەوەی گروپەکانە بۆ جێگەی مەبەستو ئامادەکار و گواستنەوەی زیندانەکان لەکاتی ئازادکردنیان.
- **جێبەجێ کردن:** (ئیقتیحام-پەیوەستی-ڕێنمونی بەند کراوان).
- **پاسەوانی:** (دابینکردنی پارێزگاری لە گروپی ئقتیحام لەنزیکەوە-دەوردانی ناوچەی زیندان).
- **جیاکەرەوە:** (سەرلێشێواندنی دوژمن-کارکردنی بێدەنگ وەك لەناو بردنی پاسەوانەکان)

- **گروپی یەدەگ و سەرکردایەتی:** بەکار ئەهێنرێن بۆ جێ گرتنەوەی بەشی ماندو یان زیان پێگەشتو.

**هەنگاوەکانی کارکردن:**

- ✓ هەنگاوی ئامادەکاری.
- ✓ هەنگاوی گەیشتن بە نزیکترین بەربەست.
- ✓ هەنگاوی جێ بەجێ کردن(بە گروپی جیاکەرەوە دەست پێ ئەکات)
- ✓ هەنگاوی پاشەکشێ وە بردنەوەی بەندکراوان.

## ▪ ئـــیــقــتیـحام لە دارســتان:

شەڕی ناو دارستان یان ناوچە دارویەکان لە کارە زۆر سەختەکانە سەبارەت بە هەمو بەهەمو جۆرە سەربازێك جا بەرگری کاربێت یان هێرشبەر چونکە کێشەی زۆر دروستئەکات لەڕوی چاوەدێریو ئاسایش کردنی سەرکردایەتی وە هەروەها پێویستە لەسەر سەربازان پرچەکبن بە باشترین ڕاهێنان وە ئەوپەڕی بوێریو ئازایەتی هەروەك چۆن پێویستی بە دەستو بردیەکی باش هەیە لەلایەن تاکی سەربازەوە.

**-جۆرەکانی ناوچە داراویەکان لەڕوی جۆری روەکەوە:**

- زەوی کشتوکاڵی وەرزی(گەنم-جۆ-.......هتد).
- ئەو زەویانەی کەپشت بە جۆگە ئاو دەبەستن.
- بێستان و دارستانە خاوەن دارە گەورەکان.

**جۆرەکان ناوچە داراویەکان لەڕوی ڕێکخستنەوە:**

- ڕێك وەکو دارستانی زەیتون.
- نارێك وەکوو (حرش) داری سنەوبەرو کینا.....هتد

**تایباتماندیه جەنگیەکانی لە دارستان:**

- گۆشەی بنین بچوکە بەپانیو درێژی.
- غفڵگیریکردن ئەگەری ڕودانی زۆرە.
- داوو تەڵە و لوغم  ئاشکراکردنی سەختە.
- واباشە کە بە ڕۆژا بچینە ناو دارستان.
- نەبونی کاریگەری زۆربەی چاودێریە ئاسمانیەکان.
- سەختی جوڵە کردن تتیایدا.
- سەختی پەیوەندی کردن.
- زیاد بونی ترسناکی لەگەڵ زیادبونی چونەناوەوە.

**باشیەکانی کارکردن لەناو دارستاندا:**

- ئاسانی کۆمۆ فلاشکردن(تمویە).
- ئاسانی خۆشاردنەوە لەچاودێری زەمینیو ئاسمانی.
- ئاسانی جوڵەکردن و دەوردانی دوژمن لە باری بونی زانیاری تەواو بە ناوچەکە.
- کاریگەری لوغم ڕێژیو خۆشاردنەوە زۆرە.
- کەمی کاریگەری چەکە قورسەکان.
- بۆمبی دوکەڵین ماوەیەکی زیاتر ئەمێنێتەوە لەناو دارستاندا بەهۆی کەمبونەوەی کاریگەری بـــــا.

**کاریگەری دارستان لەسەرتەکنیکە سەربازیەکان:**

- باڵادەستی پیادە بەسەر زرێ پۆشو ئۆتۆم بێلەکاندا بە سود وەرگرتن لە سەختی جوڵەیان لەو ناوچانە.
- سەختی پاکسازی کردن لە شەودا.
- سەختی دابەزاندنی ئاسمانیو لێدانی تۆپ هاوێژ.
- بەکارهێنانی چەکی رشاش لە هەرە کارە بەسودەکانە لە دارستاندا.

- پێویستە ئاگاداربیت لە کاتی هەڵدانی نارنجۆکدا چونکە ئەشێ چڵە دارەکانن ببنە بەربەست و رێیلێ بگرن نەگاتە ئامانج یان بگەڕێتەوە بۆ خۆت.

## گروپەکانی ئیقتیحام لە ناوچە دارستانیەکان:

❖ گروپی پاڵپشتی.

❖ گروپی دەوردان و گەمارۆدەری ناوچەی کوشتن.

❖ گروپی ئیقتیحامو پاکسازی.

❖ گروپی پوکاندنەوە.

## گروپی پاڵپشتی ئەکرێت بە دوبەشەوە:

- **چاودێری**:ئەمیش هەواڵ گیری دەکات و فەرمانەکەی هێنانی هەمو هەواڵێکە لەسەر دوژمن کە پێویستە بزانرێت.

## ئەوزانیاریانەی کە پێویستە کۆبکرێنەوە:

- جۆری دارەکان.
- جۆری زەویەکە(رەق-نەرم-گیایی-ڕوت-بونی گەڵا-......هتد)
- خاڵی لاوازو بەهێزی دوژمن سەبارەت بە دارستان.
- توندو تۆڵی و ئامادە سازی دوژمن.
- ڕێگاکانی نزیک بونەوە.
- کێڵگە مین ڕێژ کراوەکان.

*ئەشێت چاودێری لەڕێگەی(رەسەدی دور و دزە کردن(التسلل)و بێدەنگی)بێت یان لەڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە ، وە پێویستە بە بەردەوامی بێتو یەك لەدوای یەك بێت تا تەواوی گۆڕانکاریەکان لە نەخشەدا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت لە هەمو هەنگاوەکانی جەنگدا.

- **تێکشکاند**: دانانی ئەو خاڵانەی دوژمن کە لە چاودێری وەرگیراون لەژێر ئاگردا بەشێوەیەکی باش و تێك شکێن وە هەروەها لەگەڵ بەرزاییەکانی ناو دارستانو چواردەوری وە هەر جێگەیەك کە ئاگری دوژمنی لێ دەربچێت، وە لەکاتی نزیکبونەوەی گروپی ئیقتیحام لە ئامانج دەست هەڵئەگرێت لە هاویشتنی تۆپو ڕەشاش.

## گروپی دەوردان و ڕێ گری:

- بڕینی ئەو ڕێگایانەی کە ئەگات بە ئامانج.
- دەور گرتنی شوێنی شەڕو وە دابین کردنی پاسەوانی بۆ لایەکان و پشتەوە بۆ ڕێگە گرتن لەهەر هەوڵدانێکی دوژمن بۆ دەوردانی هێزەکانمان.
- هەستان بە چەند کردەوەیەکی فێڵ کردن وەك هێرشی خەیاڵی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی دوژمن و لابردنی دیدی لەسەر هێرشی سەرەکی.

## گروپی ئیقتیحام:

هەڵئەستێت بە پاکسازی شوێنە بەئامانج گیراوەکان لە نزیکەوە.

*سەرچاوەکانی مەترسی لە دارستان بریتیە لە(پشت دارەکان-ئەشکەوتەکان-چاڵە فەردیەکان-قەناص بەدەستی جێگیر کراو لە بەرزاییەکان یان سەر دارەکان یان شوێنە شاراوەکان-داوە چاڵیەکان یان پەتیەکان-زەویە لوغم ڕێژ کراوەکان.....هتد)

## جیاکردنەوەی دارستان:

گروپی پاڵپشتی هەڵئەستێت بە جیاکردنەوەی دارستان وە ئەمەش بە لێدانی سەرچاوەکانی مەترسی ئەبێت لە بەشی بەرامبەر و تەنیشت ڕوگەی پێشڕەوی کردن گروپی ئیقتیحام بۆ ڕێگە گرتنی دوژمن لە هاتنە ناوەوەو ڕۆشتنە دەرەوە وە لەبەین بردنی ئاگری دوژمن لەناو دارستانەکە یان لە چواردەورە نزیکە کانی وە هەمو خاڵەکانیتری دەوروپشت ، بۆ پارێزگاری کرددن لە گروپەکانی هێرش بردن لە هەر مەترسیەك لەو جێگایانەوەبێت وە پاشان گروپی ئیقتیحام هەڵئەستێت بە گرتنی

شوێن پێگەیەك بۆ خۆی لە دارستانەكەیا لە جێگەیەك كە كەمترین پاراستنی هەبێت لەلایەن بەرگری كارانی دوژمن.

*ئەگەر ویستمان لە دارستان نزیك ببینەوە ئەوا باشتر وایە لە شوێنە شاراوەكانەوەبێت یان داپۆشراوبێت بە درەخت هەتا كارەكە تەواوبێت بەبێ بینینی دوژمن و دوربون لە ئاگر هاوێژی و چاودێری.

*ئەگەر نەمانتوانی دزە بكەین لە ناوچەیەكی داپۆشراوەوە وە ناچاربوین كە بە ناوچەیەكی ئاشكرادا بڕۆین پێویستە بە بێدەنگی ڕێبكەین لەگەڵ چاودێری بەرزاییەكانو سەر دارەكان وە هەروەها ئەتوانرێت لەڕێگەی بەكارهێنانی نارنجۆكە دولكەڵیەكانەوە وەیان بە بەكارهێنانی هێز بە تەكنیكی (ئاگرو جوڵە).

## پاكـــــسازی:

پێشڕەوی كردن بە یەكێك لە تەشكیلەكانی ئاگرو جوڵە و ڕاونانی پاشماوەی دوژمن بۆ ئەو جێگەیەی دیاریمان كردووە لە نەخشەكەیا(خاڵی كوشتن) وە دەوردانیان لەو جێگەیەدا و مامەڵە كردن لەگەڵیان بە توندی.

*پاش تەواو بونی پاكسازی ئاماژە بە تەواوبونی پاكسازی ئەدرێت چونكە پێش تەواوبونی ئەو ئاماژەیە هەر كەسێ دەركەوێت بەدوژمن هەژمار ئەكرێت.

*باشتر وایە كە هێرش لەسەرەوە بۆ خوارەوە بكرێت.

*باشتر وایە كە پاكسازیەكە لە میحوەرێكی كورتەوەبێت تاكو ئە مەودایەی كەم بێتەوە كە پێویستە گروپی ئقتیحام بیبڕێت بەمەش كەمكردنەوەی كاتو مەترسی.

*پێویستە پاكسازی و پشكنین بكرێت بۆ هەمو بەشەكانی دارستان وە هیچ شوێنێك بەجێ نەمێنێ.

*پێویستە چەن سەربازێك دابنرێت لەسەر دارە بەرزەكان بۆ چاودێری.

*لەسەر گروپی پاسەوانی پێویستە كە هەڵهاتوەكانی دوژمن ڕاوبنێ ئەوانەی كە ئاشكرا كراون لە لایەن سەربازانی چاودێری وە دەوریانبدات.

*پشو پێدانی گروپە هیلاكبووەكانی كەهەستاون بە هێرش وە ئاڵو گۆڕكردنیان بە گروپی یەدەگ.

# کـــــمـــــین(Ambush)

کەمین هێرشێکی غافڵ گیر و لە پرتاوە لە شوێنێکی شاراوە دژی ئامانجێکی دیاری کراو وە بە شێوازێکی گونجاو ، ئەمەش تایبەتە بە سەربازانی پیادە ، یان هێرشی وەستاو دژی ئامانێکی جوڵاو یان هێرشی جوڵاو دژی ئامانجی جوڵاو.

## پـــــایەکانی کـــــمـــــیـــــن:

A. دیاری کردنی ئامانج.
B. ڕاستی زانیاری.
C. شارەزایی و گونجاوی.
D. شاراوەی و کۆمۆ فلاش.
E. نهێنی پارێزی تەواو.
F. غافڵگیری.
G. دزەکردن و هێڵبڕین.
H. هێرشکردن(ئیقتیحام).
I. پاشەکشە.

***پلان دەستپێئەکات بەدیاریکردنی ئامانج وە زانیاریە کۆکراوەکان ستراتیژیەتی پلانەکە دیاری ئەکەن ، وە بونی شارەزایی بەتوندی پاڵت پێوەئەنێ بۆپێشەوە ، وە شاراوەی دزەتپێئەکات بۆنزیك ئامانج بێ ئاشکرابون به جێبەجێ کردنی پایەیی نهێنی پارێزی ، وە نهێنی بون هەلی سەرکەوتن زیادئەکات وەیارمەتی زیاتری دزەکردن ئەدات، وە سەرکەوتن لە دزەکردن واتە گەشتنی کرداری بە دوژمن و سەرەتای هێرش وە هەرەها واتای هاتنەدی غافڵگیری ، وە بونی غافڵگیری واتە شڵەژانی دوژمن ولەدەستدانی هاوسەنگی ، وە قۆستنەوەی غافڵگیریش لەڕێگەی لێدانی بەردەواموتوند و بێ وەستان سەردەگرێت ، بەمەش لە تێکشکاندنی دوژمن نزیك**

**دەبینەوەو کۆتایی بە کمین دێت و پاشان پایەی کۆتای  ئەنجام ئەدرێت کە بریتیە لە پاشەکشە کردن لە ناوچەی کەمین.**

## بەشەکانی کمین لەڕوی سروشتەوە:

1. **کمینی تەسك:**لەو ناوچانەدا ئەکرێت کە ڕاڕەوی تەسکیان تیادا هەیە.
2. **کمینی فراوان:**لەو ناوچانەدا ئەکرێت کە ڕاڕەوی زۆری تیادایەو ڕێگەی جیا جیایی لەخۆ گرتووە.

## بەشەکانی کمین لەڕوی نزیکیو دوریەوە:

1. **کمین لەپشت هێڵەکانی دوژمن:**
2. **کمینی سنوری:** لەسەر هێڵی جیاکەرەوەمان لەگەڵ دوژمن لەڕێی چاودێری کردنی دوژمن لەسەر سنورەکان نێوان.
3. **کمینی هێڵی ئاگرین:**لە بەشی ناوەوەی ناوچەکانمان ڕوئەدات لەڕێی چاوەڕوانکردنی دزەی دوژمن بۆ ناو ناوچەکانمان بەشێوەیەکی فراوان.

## بەشەکانی کمین لەڕوی ئامادە کاریەوە:

1. **کمینی خێرا:**ئەمەش هێرشێکی غافڵ گیر و لە پڕتاوە بە نەخشەیەکی خێرا و ئامادە بەبێ پێشهات.
2. **کمینی ئامادەکراو:**ئەمجۆرەیان ئامادەکاری سەرەتا بۆ ئەکرێت بە نەخشەیەکی توندو تۆڵ دژی ئامانجێکی ستراتیژی وەك لێدانی دوژمن لە خاڵە کاریگەرەکانی لە شوێنی دیاریکراو و بۆ مەبەستێکی دیاری کراو.

*یاسای کەمین(تۆ جەنگ دیاری ناکەیت بەڵکو جەنگ دێت بۆلات-دوژمن کات دیاری ئەکات و تۆش شوێن)

## چەند تێبینیەك:

*لە کمیندا پێویستە تەواوی پێویستیەکانت لەگەڵ خۆت هەڵگریت.

*داپۆشین و خۆشاردنەوە بەباشی پایەیەکە لە پایەکانی کمین.

*پێویستە جلەکانت خاڵیبێت لە هەر شتێکی سەرنج ڕاکێش و درەوشاوە.

*پێویستە هێما بەکار بهێنرێن لەباتی وتە.

## ڕێــکخســتنی کــمــین:

سروشتی خاکەکەو بەرزونزمی تێیدا و بارودۆخی دوژمن کۆمەڵە شتانێکن ڕێکخستنی پێویست دیاری ئەکەن بۆ کمین وە جۆری ڕێکخستنی کمین هۆکارییەو شایەنی گۆڕانە ، وە هەروەها ئەشێت کمینی تێکەڵ درست بکەیت بە وەرگرتنی چەند جۆرێکی ڕێکخستن.

## چەند جۆرێکی ڕێکخستنی کەمین:

1. **هێڵی ڕاست:** ئەماش لە شوێنە تەسکو فراوانەکاندا ئەکرێت شێوەکە(لەناوچە تەسکەکاندا لەسەر شێوازی درێژیە وەلە ناوچە فراوانەکان لەسەر شێوازی پانییە).



2. هیلالی(چەماوە):ڕاستەو ڕاس لە پێش ئامانج بە شێوەیەکی چەماوە ئەوەستیت




3. **پیتی(*L*)**: لە کاریگەرترین شێوازەکانی کمینە بەکاردیت لەسەر ڕێگاکان و ناوچەشاخاویەکان و ناوچە تەختەکان بەمەرجێك ڕێگەی دزەی دوژمن بگیرێت بۆ دەوردانمان.



4. شێوازی (**V**):-زوربە کات لە ناوچەی تەسکو شاخاویا بەکاردێت وە ئەتوانرێت لە ڕێگەیەوە دوژمن گەمارۆبدرێت.



5. **شێوازی چوارلا**: بەکاردێت لەناوچە بڵندەکاندا بۆ پەرتەوازەکردنی یەکینەکانی دوژمن.



6. **شێوەی چنگی هەڵۆ:** لە ناوچە شاخاویکانا بەکاردێت لەسەرو دۆڵەکانەوە یان سێ ڕێیانو چوار ڕێیانەکادا.



7. **شێوازین پیتی(Z):** هاوشێوەی پیتی ( **L** )ە بەڵام کلکێکی بۆزیاد دەبێت لەپێناو پاڵپشتی.



## کاتەکانـــی کـــمین:

1. **بەشی دەرەوەی هەڵسەنگاندن:** ئەمیش پشت بە یاسای (دوژمن کات دیاری ئەکاتو منیش شوێن)
2. **بەشی ناوبازنەی هەڵسەنگاندن:** ئەتوانین بەرێژەیەك كاتێك دیاری بکەین لەو ماوەیەدا کە باری کمین لەسەر دوژمن گونجاوە وەك(کمینی تەکتیکی) وە

باشترین کات لەشەودایە کاتژمێرەکانی گزنگ و لە ڕۆژدا پێش ڕۆژئاوا بوون وە باشتر وایە کە لە کاتی عەسر دور بکەوینەوە چونکە سوڕی خوێن تیایدا چالاکە.

## گرنگی کـــمــــین:

1. **غافڵگیری دوژمن لەکاتو شوێندا:** لە گرنگترین بنەماکانی جەنگە وە بە بناغەی سەرکەوتن دائەنرێت.
2. **دەست پێشخەری:** ئەمەش خودی خۆی کاتو شوێنی گونجاومان پێئەدات بۆ جێبەجێکردنی هێرش.
3. پێویستی بەژمارەیەکی زۆر لە سەربازنیە.
4. شڵەژاویو تێکچونی بارو دۆخ دروستئەکات لەناو ریزەکانی دوژمن چونکە دوژمن ناتوانێ شوێنو کاتی لێدانەکە بزانێ و دیاری بکات هێرشی داهاتوو لە کوێوە ئەبێت.
5. ئازادی هەڵبژاردنی هێرش**(کردن یان نەکردن):** ئەتوانین ڕەتی بکەینەوە لە هەربارێك هوستمانکرد نرگونجاوە.

## باشترینی شوێنە کان بۆ دانانی کمین:

1. **ناوچە سەختەکان:**چونکە جوڵەی ئۆتۆمبێڵ تیایدا کەمە ئەمەش هەلێکی باش ئەدات بە سەربازان بۆ پاشەکشە کردن.
2. شوێنە داپۆشراوەکان بە دار چونکە کرداری خۆ حەشاردان تیایدا ئاسانە.
3. شوێنێکی هەورا ز یان دۆڵێك کە چیای بەسەردا بڕوانێت.

*کمین لە ناوچە خەڵك نشینەکاندا باشتر وایە لە دوڕیان یان چوار ڕێیانەکاندا بکرێت وە لە دەرەوەی باڵەخانەکاندا.

*کمین لە دارستانەکاندا باش وایە لە کۆتای دارستانەکە و لە ڕاڕەو و ڕێچکەکاندا بێت، وە پێویستە ڕەچاوی جوڵە نەکردن بکرێت بە زۆری لەبەر دورکەوتنەوە لە کەوتنە نێو کەمینی دوژمن.

*کمین لە کەنار ڕوبار پێویستە ئەوکەسانەی بەشداری تیائەکەن مەلە بزانن وە باشتر وایە لەسەر ئەو ڕێچکانە دابنرێت کەبەرەو ڕوبارەکە دێت یان لەسەر پردەکان.

*کمین لەشاخدا زۆربەی کات لەسەر مەمەڕە ناچاریەکان یان ڕێگا تەسکەکان دائەنرێت وە پێویستە تاکەکانی کمین تواناى ڕێکردنی ناوچەی شاخاویان هەبێت وە بەجۆرێکبێت کە دوژمن بکەوێتە بەشی خوارەوە تا هێرش بۆکردنی ئاسانبێت.

## چۆن پێشڕەوی بکەین بەرەو ناوچەی کمین:

1. پێویستە گروپی کمین لە 4 کەس کەمتر نەبێت وە هەریەکێك لەم چوارە کارو تایبەت مەندی خۆیان هەیە.
2. سەرکردەی گروپەکە دیاری ئەکرێت پێش دەرچون وە دەرناچن تا ئەوکاتەی هەر سەربازێك تەواوی پێویستیەکانی دابین نەکات بەجۆرێك ئەگەر ڕوبەڕوی گەمارۆ بویەوە بەشی بکات.
3. سەرکردە دەر ئەچێتو ئاماژە بە دەرچونی سەربازەکان ئەکات لەڕێی ئامرازی دیاریکراو زانراو لەلای تەواوی سەربازان.
4. دوو سەرباز پێش و دوای ڕەتڵەکە ئەپارێزن و ئامنی ئەکەن وە دوانیتر چەپو ڕاست.

## چۆن هەڵسوکەوت بکەین لەباری دزە کردن بۆ پشت هێڵەکانی دوژمن:

1. ژمارەی سەر بازان کەمئەکەینەوە بەپێی پێویستی فرمانەکە وە هەروەهاوتمان کە کەمترین ژمارە( **4** )ە
2. پێویستە سەربازەکان خاوەن شارەزاییو ئەزمونی جۆراو جۆربن بەجۆرێك هەمویان پێکەوە تیمێکی تەواوکەری پێك بهێنن.
3. سەرکردە دیاری ئەکرێت پاش دیاری کردنی پێویستە کۆبونەوەیەك بکات هەر کەسەو تیایدا بۆچونی خۆی بڵێت ئەمەش بە(زاخاوی مێشك)ناو ئەبرێت.
4. پێویستە بەبەردەوام پەیوەندی لەنێوان گروپەکاندا هەبێت.
5. لەکاتی پێشرەوی و دزە بۆ پشت هێڵەکانی دوژمن پێویستە کاتی غەفڵەتو بێ ئاگای دوژمن بقۆزیتەوە.
6. دوای دانانی تەواوی (گریمانەکان) پێویستە پێشبینی خراپترین بار بکەێت چونکە لەوانەیە باشترین رونەیات.
7. پێویستە هەر سەربازێك تەواوی پێویستیەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرێت بۆ مانەوەی ماوەیەکی زۆر گەر پێویست بکات.
8. دورکەوتنەوە لە هەرشتێکی سەرنج ڕاکێش لە چێشتلێنان یان کردنەوەی ئاگر یان بەکارهێنانی بۆن یان شتی بریقەدار لەسەر جلوبەرگ.
9. پێویستە لەسەر گروپ کە هیچ پاشماوەیەك دوای خۆیان بەجێ نەهێڵن هەتا پاشەڕۆکانی لەش.

10.پێش دەست پێکردن بە جوڵە پێویستە خوێندنەوە بۆ پلانەکە بکرێت بە باشی وە پلانی یەدەگ**(plan B)** دابنێن کە پاشەکشەش لەخۆ ئەگرێت.

11 ئەگەر پێویست بو ئەوا بەپێی توانا سود لە بەکرێگیراوان لەناو دوژمن وەر بگرە بەڵام پێویستە وریا بین چونکە جاسوس لەوانەیە دو ڕوبێت.

12 کردەوەی دزەکردن بۆ پشت هێڵەکانی دوژمن ترسناکو هەستیارە لەبەر ئەوە پێویستە پێشرەوی بە شێوەیەکی بەرگری بێت کە هەمو لایەکان بپارێزێت وە ئەوەش پێی ئەوترێت**(بەرگری تەواو)**

13 سەرکردە پێویستە هەمیشە لە بارێکدابێت کە یارماتی بدات بۆ تەقەکردن وە زۆربەی جار لە پێشەوەی ڕەتڵەکە ئەبێت.

## بۆ زانیاری:

1. ئەتوانین بێ باکبین لە گروپی بڕینی یارمەتی دوژمن بە بەکارهێنانی بۆمب و تەڵەوداو لەسەر ڕێگەی یارمەتی.
2. ئەتوانین بێباکبین لە گروپی پاڵپشتی بە بۆمبڕێژ کردنی ناچەی کوشتن بە تەقاندنەوەی بۆمبەکان و پاشان چونە پێشەوە بە چڕکردنەوەی ئاگر.
3. ئەتوانرێت گروپی چاودێری هەمان گروپی پاسەوانی بێت.

## نیشانە و هێماکانی کمین:

- **هێمای گەشتنی ئامانج:** ئەم هێمایەش هێمایەکی شاراوەی بێدەنگە و لە ڕێگەیەوە تەواوی گروپەکان خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ دەستپێکردن وە ئەوەشی ئەم هێمایە ئەدات گروپی چاودێریە لە ڕێگەی بەکارهێنانی(لاسلکی-دەرکردنی دەنگی ئاژەڵ-یان هەر هێمایەکیتر بەمەرجێك سەرنجی دوژمن ڕانەکێشێت)
- **هێمای دەستکردن بە تەقە:** ئەکرێت لەڕێگەی تەقاندنی چەند فیشەکێکی گردارێت لەلایەن سەرکردەی کمینەوە زانراوبێت لە لایەن تەواوی سەربازانەوە.
- **هێمای هێرش کردن:** لە کمینی تێکشکاندندا بەکاردێت لەڕێگەی بێ تەل یان بەدەنگ یان فیکە یان بە هەمان شێوە لە ڕێگەی چەن فیشەکێکی گردارەوە ئەبێت لەلایەن سەرکردەوە یان بە تەقاندنی ***RPG***.
- **هێمای وەستاندنی تەقە:** لەڕێگەی لاسلکی یەن تەقاندنی بۆمبێکی دوکەڵین یان فیشەکێکی تەنوری یان هاوەنی ڕوناککەرەوە یان هەر هێمایەکیتر.
- **هێمای پاشەکشێ:** بەتەقاندنی چەند فیشەکێکی گردار بەرەو دواوە بە ڕەگبار.

- **هێمای گۆڕینی ئاڕاستەی تەقەکردن:** زوربەی کات لەڕێی تەقاندنی فیشەکی گردارە بەرەو ئەو ناوچەیەی کە سەرکردە ئەیەوێت ئاڕاستەی تەقەی ڕوتێبکرێت.

## جۆرەکانی کمین:

### لەڕوی شێوازی جێبەجێ کردنەوە:

1. **کمینی جێگیر:** ئەمەش لەزۆربەی کمینەکاندا بەکاردێت بەجۆرێك گروپەکان و یەکینەکانی کمین جێگیرن وە دوژمن.
2. **کمینی جوڵاو:** ئەمیش زیاتر بە ماتۆڕیان ئوتومبێلو زرێ پۆشەکان ئەکرێت لەڕێی دواکەوتنی ئامانج و پاشان لەناو تەڵە نانیان ، زیاتر لە جەنگی پارتی زانیدا بەکاردێت.

### لەڕوی دابەشبونی هێزەکانی کمین:

1. **کمینی ناوچەیی:** بەجۆرێك دوژمن بڵاو بۆتەوە وە لەگەڵ ئەمەش ئەبێت هێزی کمین بڵاوبێتەوە بەشێوازێك گونجاوبێت لەگەڵ بڵاو بونەوەی دوژمن ، بۆ نمونە لەوانەیە ئامانج چوار ڕەتڵ بێت وە نێوانی هەر ڕتڵێك بۆ ڕەتڵێکیتر 150م بێت بەمەش نێوان یەکەم ڕەتڵ و کۆتا ڕەتڵ 450م دەبێت ، جائەگەر کمین تەنها لەیەك شوێندا کۆببێتەوە ئەوا ناتوانن تەواوی ئامانجەکە بپێکن ، بۆیە پێویستە هێزی کمین بەدرێژای ڕەتڵەکان دابەشبن بەجۆرێك هەمویان لەهەمان کاتدا ئامانج بپێکن.



2. **کمینی خاڵی:** ئەمیش لەکاتێکادەبێت کە ئامانج دابەش نەبوبێت بە بڵاوی واتە تەنها هیلێك بێت و لەیەك خاڵەوە توانای پێکانی هەبێت.

## کمین لەڕوی کاتەوە:

1. **ڕۆژ:**
2. **شەو:**

## کمین لەڕوی مەوداوە:

1. **کمینی نزیك:** پێویستە ئاگاداربیت ئەگەر ناوچەکە توانای پاشەکشێی خێرای تیانەکرا ئەوە پێویستە ئاستەمبێت شوێنکەوتنت لەلایەن دوژمن وە دەبێت ڕە چاوی چەکی بەکارهاتوو بکەیت چونکە گەر چەکی ڕەشاشو نارنجۆکی دەستیو دەمانچەت لەبەر دەستبو ئەوا ماوەی نێوان تۆو دوژمن نابێت لە 40م زیاتربێت.
2. **کمینی دور:** بەهەمان شێوە پێویستە ڕەچاوی چەکە بەردەستەکان بکرێت بەپێی ئەو مەودایەی کە دەکەوێتە نێوان تۆو دوژمن وە زۆربەی کات ئەم جۆرە کمینە بە تەقاندنەوەی موشەك یان **RPG** دەست پێئەکات وە قەناصە چەکی سەرەکیە تیایدا وە پێویستە چەکە قورسەکان لەناوچەی سەختبن وە پاشەکشێ کردن پێیان ئاسانبێت چونکە پێویستی بەکاتی زیاترە بۆ دورخستنەوەی وە هەروەها تەواو شاراوەبن.

## کمین لەڕوی جۆری فرمان:

1. **کمینی وێران کردن:** پێویستە پاش لێدان ئقتیحام بکرێت تا دڵنیابین لە شکاندنی دوژمن.
2. **کمینی بۆردومان:** ئەمیش تەنها تێیدا بۆردومانی دوژمن ئەکرێت بەبێ ئقتیحام و بردنی دەستکەوتی ماددی و پاشان پاشەکشەکردن بێ دڵنیابون لە شکانی دوژمن.

**لەڕوی جۆری ئامانجەوە:**

1. **کمینی ئامێر:** (ئۆتۆمبێل-زرێ پۆش-بار هەڵگر....هتد)
2. **کمینی پیادە:**سەربازانی پیادە.

## مەرجەکانی کمینی سنوری:

**پێناسە/** سەرباز زۆرتر پێویستی بە چاوەدێریکردنی جوڵەی دوژمن ئەبێت هەتاکو بیکاتە تەڵەوە، وە بۆ ئەمەش پێویستە زۆر سەردان و دزە بکات بۆ هێڵەکانی پشتەوەی دوژمن و ئەمەش ناکرێت بەبێ دانانی پلانێکی ڕێکو ڕاست ، لەبەر هەستیاری ئەو ناوچەیە وە ئەوکەسەی دائەبەزێتە ناو مەیدان ئەزانێ کە پێویستە لەسەری زۆر ئاگاداربێت لە هەڵەی گەورە ، وە تێنەکەوتنی ، وە پێویستە سەربازان پێشڕەوی نەکەن بەبێ بەرچاو ڕۆشنی سەربازیانە کە شێوازی پێشڕەویەکەیان بۆ ڕێك بخات . وە گەر بەبێ بەرچاو ڕۆشنی پێشڕەویان کرد ئەوا چاوەڕێی خراپترین بار بکەن ، وە زۆریش ڕویداوە کە سەربازان توشی مەترسی بون نەك تەنها لەسەر دەستی دوژمن بەڵکو لەسەر دەستی هێزەکانی هاورێ بەهۆی نەبونی ڕێکخستنێکی باش و نەبونی زانیاری تەواو بەناوچەکە و نەبونی پلانێکی ڕون تا چۆنیەتی پێشڕەویو پاشەکشە ڕێك بخات.

## مەرجەکان:

1. ناوچەکە بەکەڵکی جوڵەکردن بێت وە پێشتر دوژمن پشکنینی ئاسایش کاری تیادا نەکردبێت بەهیچ جۆرێك.
2. دڵنیابون لە گرتنی هەمو کەلێنەکان وە ئاسایش کردنی ناوچەکە لە هەمو لایەکانەوە بە شێوەیەکی گونجاو.
3. ڕەچاو کردنی ماوەی کمین بەو شێوەیەی لەگەڵ توانای سەربازان بگونجێت.
4. خوێندنەوەی ناوچەکە لەڕوی بەرزیو نزمی و ڕێگەو بان.
5. ڕەچاو کردنی بارو دۆخی کەشو هەوا چونکە بەڕادەیەکی زۆر کار لە هەڵسوکەوتی سەرباز ئەکات **(ساردی دوژمنی سەربازە)**بۆیە پێویستە خۆی لێ بپارێزێت وە هەروەها کەشی باراناوی کار لەسەر خۆڵ ئەکات.

6. خۆشاردنەوەو دانانی پارێزەر **(قەڵا بەندی)** بەپێی پێویست.
7. دانانی نەخشەیەك کە هێرشو پاشەکشە بگرێتەخۆ وە هەروەها نەخشەی یەدەگ(بدیل).
8. پێویستە سەرباز تەواو ئاگاداری ئەو تکنیکانەبێتو بیانزانێت کە پێویستە بەکاری بهێنێت لە کمین وە ئەمەش ئەبێتە هۆی زیاتر جێگیر بونی لە جەنگدا چونکە ئەزانێ چۆن ڕوبەڕوی دوژمنەکەی ببێتەوە ، وە متمانەی بەخۆی هەیە چونکە(المجهول مخیف)نەزانراو ترسناکە.
9. هەڵگرتنی تەواوی پێویستیەکان لەگەڵ هەر سەربازێك.
10. پێویستە تا 100م بە بازنەی لەژێر بینینداب‌یت واتە خاڵی کوشتن نابێت شوێنی خۆ حەشاردانی تیابێت.
11. بەردەوامی پەیوەندی لەنێوان سەربازان و سەرکردایەتی هەتاکو سەرباز هەست بەتەنهای نەکات لە مەیدانی جەنگدا وە بەردەوام باری دەرونی بەرزبێت.
12. دابەشکردنی سەربازان بەجۆرێك ئاسایشی ناوچەکە بپارێزێت و هەمو کەلێنەکان بگرێت بۆ نــمــونە:

- ✓ سێ سەرباز لە پێشەوەن فەرمانەکەیان تێك ڕژانە لەگەڵ دوژمن وە تەواوی پێویستیەکانی تێکرژانیان پێیە( **-p k c - R p g-کلاش-نارنجۆك.....هتد)**. بەرپزێکی ڕاست ئەوەستن نێوان هەر سەربازێکو سەربازێکیتر15م بێت بەلایەنی کەمەوە وە سەربازی پێشەوە کەمێك لەپێش دوانەکەی تر ئەبێت.
- ✓ دوو سەرباز بۆ تەقاندنەوەی لوغمەکانی کە ئامادەکراون بۆ کەمین.
- ✓ دوو سەرباز بۆ دژە زرێپۆش(م.د)
- ✓ لەدوی ئەوانە فەرمانی گروپی پاڵپشتی دێت ، کە بەلای کەمەوە پێویستە دوو سەربازبێت ئامادەکراوبن بە چەکی مامناوەند**(دۆشکە12.7-زوکیاك14.5-هاوەن60ملم یان80ملم-هەرجۆرێکیتری تۆپ هاوێژ)**بۆ لێدانی هەر کۆمەڵ بونێکی دوژمن و پەرتەوازە کردنیان یان بۆ داپۆشینی پاشەکشەی هێزە هێرشبەرەکان.




*ئەگەر ئەم مەرجانە نەهاتنەدی بەلای کەمەوە لە کمینی سنوریدا ئەوا پێشڕەوی مەکەو سەربازیش مەنێرە وە هەمیشە وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارانە دابنێ(**بۆچی ئەم شوینەت هەڵبژارد؟ وە چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێت؟)**

## پێویستیە نمونەییەکانی سەربازلە کەمیندا:

1. قەناصە
2. رەشاشAK47-M16-PKC
3. دەمانچە بۆ پارێزگاری تاکە کەسی.
4. جلوبەرگی یەدەگ.
5. سەرچاوەی ئاگر کردنەوە(چەرخ-داری گۆگردین-بەردی گڕ پۆش)
6. پیل
7. لایتی دەستی.
8. پەت و گوریس.
9. دوربینی شەوو رۆژ

11 . فریاکەوتنی سەرەتایی.

12 . مقەست.

13 . چەقۆ.

14 . منشاری ئاسنبڕ.

15. منشاری داربڕین.

16 . لەزگە و چەسپ.

17 . ئەدەواتی کۆمۆ فلاش.

18 . بڕێکی باش لەئاو بەتایبەت لە هاویندا.

19 . مۆبایل ئەگەر توانرا وەگەر نا ئالەتی *G p s*.

20 . خواردنو خواردنەوەو گۆشتی وشککراو.

21 . ئامێری بێتەل(قبضة).

22 . زەخیرە و فیشەك.

*پێویستە هەر سەربازێك **5** مەخزەن هەڵبگرێت پڕلەفیشەکبێت وە **300** فیشەکیش زیادە وە هەروەها **5** نارنجۆکی دەستی و دوو نارنجۆکی دوکەڵین لە باری نەبونی هەڵگرانو تیمی یارمەتی تەقەمەنی.

## زانیاریە پێویستەکان بۆ کمین:

1. ڕێگای بەکارهاتو لەلایەن ئامانج.
2. کاتی هاتنی بەو ڕێگایەدا.
3. ژمارەیئامێرەکانی دوژمن.
4. ژمارەی تاکەکانی دوژمن.
5. جۆری چەکەکانی دوژمن و ژمارەیان.
6. شوێنی سەرکردەی مەفرەزەکانی دوژمن.
7. ڕێژەی ئاگاداری دوژمن.
8. جۆری ئامێرەکانو توانایان.
9. خێرای دوژمن چەندە لە ناوچەی کمین.
10. شوێنی نزیکترین یارمەتی دوژمن لە ناوچەی کەمینەوە لە کوێیەو چەندی پێدەچێت بۆ گەشتن بە شوێنی کمین.
11. چەنێکمان پێویستە بۆ پاشەکشە.
12. چ شێوەیەك گونجاوە بۆ کمین(بۆمبی چێنراو-کمینی ئاگرین-جێگیر-جولاو-نزیك-دور-لەلاوە لەپێشەوەو لە دواوە)
13. چ جۆرە چەکێك گونجاوە بۆ لێدانی دوژمن.

*پاش دانانی پلانێکی گونجاو بە ناوچەکەو بە پێی توانای خۆمانو دوژمن پێویستە ڕاهێنان بکەین لەسەر کەشو شوێنێکی هاوشێوەی شوێنی کمین وە پاشان سەعاتی سفر دیاریبکەین بۆ هێرش وە لە هەمو ئەمشتانە گرنگتر بۆ مجاهد پاکی نیەتەکەیەتی بۆ خوای گەورەو پشتبەستن پێی دڵنیابون لە نەڕشتنی خوێنی هیچ بێتاوانێك.

*پێویستە لەکاتی تەقە کردن لە ئامانجی جوڵاودا ماوەی پێشکەوتنمان بیرنەچێت بۆ نمونە ئوتومبێلێك بە خێرای **80کم/سەعات** ئەڕوات وە مەودای کوشتن بریتیبو لە **100م** ئەوا ئەتوانێت لە ماوەی **4.5**چرکەدا دەربازبێت . وە ئەگەر ویستمان ئامانجێك بپێکین کە بەخێرای **60کم/سەعات** دەڕوات وە لە دوری **100م** وە فیشەك دەگاتە ئامانج لەو دوریەدا بە **0.55**چرکە واتە ئەگەر نیشانە لە نوکی ئامانجەکە بگرین ئەوا

فیشەکەکە ئەیدا لە پشت ئامانجەکە بەنزیکەی **600سم** ، بۆیە پێویستە فیشەکەکەمان بنێین بە بەردەم ئامانجەکەوە بە **6م** وەگەر توانیمان بە گۆشەی **45**تەقەی لێ بکەین بەم جۆرەی لای خوارەوە.




*لە کمیندا پێویستە شێوازی ڕێگاکان بناسیت وە چ جۆرە پێویستیەك گونجاوە بۆیان.

## جۆرەکانی ڕێگە:

1. **پیشەیی(ئامادە کراو):** بریتیە لەو ڕێگایانەی کە بەدەستی مرۆڤ دروستکراون وە پانیەکەیان لە 2م - 20 م وە **(چەوین-قوڕین-بەردین-دارین-قیر).**
2. **نا ساز(تولەڕێ):** ئەو ڕێیانە ئەگرێتەوە کە بە ڕۆشتنی ئەژەڵ دروست بووە.
3. سروشتی: جۆگەی ئاویان هاوشێوەکانی.

*دورکەوە چەندێك ئەتوانی لە ڕێگەی قوڕین و لیتە.

*پاشماوە لە سەر ڕێگەی قوڕین و چەوین ڕون دیارە.

*پێویستە وریابیت لە تەڵەو داو لە سەر ڕێگە داپۆشراوەکان بە دارستان.

## هۆکارەکانی شکست خواردن لە کمیندا:

1. کەمی پێداویستی سەنگی جەنگ تێکئەدات.
2. بونی کەلێن لە دەستکەوتنی زانیاری ئەتگەیەنێت بەوەی کە ناتەوێت پێی بگەیت.
3. لاوازی پلان ئەبێتە هۆی دارمانی خێرا.
4. نەبونی شارەزای واتلێئەکات کە بە شێوازێکی نادروست کار بکەیت.
5. بونی هێزی هاورێ لە ناوچەی کمین بەبێ زانیاری پێشوەخت.
6. گۆڕێنی شوێن لەکاتی گەشتنی دوژمن و شڵەژان و ترسو دڵە ڕاوکێ.
7. بیرنەکردنەوە لە فەرمان و خەیاڵ ڕۆشتن بۆ دەرەوەی کمین ، بەجۆرێك هەمو خواستی سەرباز تەواو بونی و گەڕانەوەبیبێت بۆ ماڵەوە یان سەربازگە بە خێرای.
8. نەبونی ڕێکخراوی لە تەقەدا بەجۆرێك بەشی پێشەوە بکەوێتە ژێر ئاگری گروپی پاڵپشتی و پارێزگاری.
9. پچڕانی پەیوەندی لەنێوان یەکینەکان.

10 . نەبونی متمانەی سەرباز جا بەرامبەر خودی خۆی وەك ئەوەی وا بزانێ کە ئەو ناتوانێت ئەو کارە ئەنجامبدات یان بەرامبەر نەخشەکە بەجۆرێك باوەڕی وابێت کە ئەو نەخشەیە سەرناگرێت وە یان نەبونی متمانە بە سەرکردایەتی وا بڕوانێت ئەم کارە بەرهەمەکەی کۆمەڵێك سەرکردە ئەیخۆن لەسەر حسابی خوێنی سەربازان.

11 . نەبونی ئامانج لە شوێنی دیاریکراو.

12 . نەبونی زانیاری بە خاکو چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیا.

**نگەتیڤیەکانی کەمین:**

بەهۆی نەزانیمان بە کاتی دەرکەوتنی دوژمن وەدیاری کردنی کات لەلایەن دوژمنەوە ماوەی مانەوە لە ناوچەی کمین دیاری نەکراوە لەوانەیە چەند کات ژمێرێك یان چەند رۆژێك بخایەنێت بۆیە پێویستە هەڵبژاردنی سەربازان لە ئارامگرو بەتواناکانبن وە گروپی چاودێری زانیاری دروست بدات لەسەر ماوەی کاتی دەرکەوتنی ئامانج لە ناوچەی کمین.

*__کەمینی جوڵاو:__ زۆربەی کات لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئوتۆمبێلەوە دەبێت بەجۆرێك لەناوچەی کمین تەواوی ڕێگەکان گیرابێت وە ڕێ لە دوژمن ئەگیرێت لە پێشەوە و پاشان لێدانی لە دواوە.

## تەکنیکەکانـــی تـــــێـــــکـــــــڕژان(الاشتباك):

1. لەکاتی تێکرژان چاودێری یەکەکە یەکەم کەسە کە تەقە ئەکات وە باقی یەکەکە بەخێرای شوێنی تەقە کردن ئەگرێن وە پاش کوشتنی کەسی پێشەوەی دوژمن وە دابەزاندنی سەریان و کەمبونەوەی تەقەی دوژمن دوای چرکردنەوەی تەقە لەسەری یەکەکە هەڵئەستێت بە پاشەکشێ بەرەو دواوە لەسەرشێوەی دوو گروپ بەجۆرێك گروپی یەکەم پاشەکشێ ناکات تا دڵنیا نەبێت گروپی دووەم پشتی ئەگرێت و داپۆشینی بۆ ئەکات.
2. پاشەکشە ئەکەن لەسەر شێوەی دوو گروپ بەشێوەی زیکزاك بەهەمان شێوە گروپی یەکەم پاشەکشە ئەکات گروپی دووەم داپۆشینی بۆ ئەکات جارێك جیائەبنەوەو جارێکیتر ئەکئەگرنەوە.
3. لەسەر شێوەی تاکە کەسی کەسی پێشەوە تەقە ئەکات لەکاتی کەسی پێش ئەو بەرەو دواوە ئەکشێتەوە.

*لەدوای تێکرژان ئەگەر توانرا ئەوا دەوردان ئەنجام ئەدرێت وە گەرنا ئەوا پاشەکشە ئەکرێت تا لە هێڵی ئاگرینی دوژمن دەرئەچیت.

*پێویستە سەرباز لەکاتی تێك ڕژاندا پارێزگاری لە تەواوی ئەو پێویستیانە بکات کە هەڵیگرتووە وە نابێت شڵەژان هۆکاربێت لە بەتاڵکردنی مەخزەنو بەفیرۆدانی فیشەك.
*ئەگەر لەکاتی تێکرژان لەگەڵ دوژمن هێزت کەمتربو ئەوا هەوڵمەدە دیل بگریت چونکە لەوانەیە دوژمن تورەتر بکات وە هەوڵبدات بۆ بنەبڕکردنت وە ئەگەر توانیت ڕێگەی پاشەکشە دابین بکەیت بۆ گواستنەوەی دیلەکان ئەوا ئەتوانیت دیل بگریت وەگەر نا ئەوا تەنها بکوژە.

## بــــەرگـــــری

ستراژیتیەتی بەرگری کردن ڕێگرتنە لە خودی دوژمن و هێرشەکانی بە بەکارهێنانی هەمو جۆرە تەکنیکە بەردەستەکان بەمەبەستی دواخستنی سەرکەوتنی دوژمن و گەشتنی یارمەتی هاوڕێ یان بۆ ناچارکردنی دوژمن بە کشانەوە و دورخستنەوەی مەترسی دوژمن.

**تەکنیکی بەرگری**:وەستاندنی پێشڕەویەکانی دوژمنە لەڕێگەی بەهێزکردنی هێڵەکانو قەڵا بەندیو هێرشی هەڵگەڕاوە و هەمو جۆرەکانیتر لەفێڵو داوەکان.

### تەکنیکی هێرشی هەڵگەڕاوە:

لەکۆنەوە وتراوە باشترین هۆکار بۆ بەرگری(هێرشبردنە) ئەمەش لەڕێگەی ڕێگەدانە بەدوژمن بۆ شکاندنی چەند هێڵێکی بەرگریمان و هاتنەناو مەیدنێکی ناڕون وە پاش هیلاککردنیان دوبارە هێرشکردنەوە سەریانو دەرکردنیان لە ناوچکە جا بە بەکار هێنانی تکنیکی دەوردان بێت یان چەکوشو سیندان یان بە بەکارهێنانی **تەکنیکی میحوەری** بە گێرانەوەی دوژمن بەو شوێنەدا کە لێوەی هاتوەو بەردەوامبون لە شکاندنی هێڵەکانی چەنێك توانرا بۆ لاوازکردنی باری دەرونیان وە پاشان کشانەوە بۆ جێگەکانی کە قەڵا بەندیمان تیا کردووە لە  پێشودا یان جێگیربونو دروستکردنی قەڵابەندی لەشوێنە نویەکان.

### تکنیکی بەرگری لە قوڵاییەوە:

زیاتر ئەو دەوڵەت یان کیانانە بەکاری ئەهێنن کە مەودای ناوچەکانی ژێر دەستیان فراوانە وە بواری گەڕانەوەیان ڕەخساوە بەرەو ناوچەکانی پشتەوە، بەهۆی کشانەوەیان بەرگری کار بەرەو دواوەو دورکەوتنەوە لە شەڕی بێ سود لەناوچە نا ستراتیژیەکانو کۆکردنەوەی هێز لە نزیك ئامانجەکانی دوژمن وە پاشان بەرگریکردن لەو ئاماجانە بە هێز وە بەدڵنیاییەوە دوژمن هێڵە یارمەتیەکانی دور ئەکەوێتەوەو بەخێرای یارمەتی پێناگات(وەگەر پێشی بگات ئەوا بە مەسروفێکی زیاتر پێ ئەگات)

وە ئەتوانرێت هێڵە یارمەتیەکانی ببڕدرێت بەهۆی درێژیانەوە وە دەتوانرێت تەکنیکی هێرشی هەڵگەڕاوەی لەگەڵدا بەکار بهێنرێت بەڵام لەکاتی دڵنیابون لەدەست خەڕۆی دوژمن و نەمانی هێز بۆ یارمەتیدانی سەربازانی.

*هەمو پلانێکی بەرگری گشتگیرە وەگەر گشتگیر نەبێت ئەوا پێیناوترێت پلانی بەرگری.

*بەرگری بەهێز باشترە لە هێرشی بەهێز چونکە تەمەنی بەرگری زیاترە وە هەلەکانی زۆرترە ، وە هێرشێکی شاراوەیە دژی هێرشێکی ئاشکرا و دیار.

*پێویستە لە نەخشەی بەرگریدا تەواوی توانا بەردەستەکان بەکاربهێنرێت.

## پایەکانی پلانی بەرگری:

1. **ئامانج:** لە هەمو کردەوەیەکدا ئامانجێك هەیە وە لەبەرئەوەی لێرەدا کردەوەکە بەرگریە ئەوا ئامانجەکەی پاراستنی بەرەی ناوەکیە لەگەڵ لێدانی پێشڕەویەکانی دوژمن و گرتنی پێشی و ڕێگە گرتن لە بەدەستهێنانی ئامانجە ستراتیژیەکانی لەڕێگەی فێڵو مانۆڕەوە.
2. **بونی زانیاری:** زانیاریەکان لەسەر هێرشبەر چۆنێتی بەرگریکردن دیاری ئەکەن ، بۆیە پێویستە لەسەر پلاندانەر کە ویستو خواستی دوژمن بزانێت و زانیاری تەواوی بە سروشتو تکنیکو تکتیکەکانو جۆری چەکەکانی دوژمن هەبێت.
3. **توانا:** داهات بەردەستە بۆ هەموان بەچاو پۆشیکردن لە سروشتی داهاتەکە بەڵام پێویستی بە مەغز(عقڵ)ێکە بەڕێوەی ببات بە جۆرێك سەنگی جەنگ هەڵبگێڕێتەوە لەبەرژەوەندی خۆی.
4. **کات:** هەرساتێك لەلایەن تۆوە بەفیڕۆ ئەدرێت دوژمنەکەت ئەیقۆزێتەوە ، وە بۆتۆ نیە هەڵی بژێریت کەی بەرگری ئەکەیت چونکە بەرگریکردنەکەت پەیوەستە بە هێرشی دوژمنەوە ، بەڵکو خۆڕاگریە لە پێش لێدانەکانی دوژمن وە هەڵمژینی ئەو لێدانە بەهێزەکان و توندەکانی یەکەمیەتی چونکە هەمیشە لێدانی یەکەم سەنگی مەحەکی سەرکەوتنە گەر شکاندت ئەوە لێدانەکانی

دوای ئەوە ئاسانترە شکاندنیان وە هەروەها لێدانی یەکەم ڕێڕەوی جەنگ دیاری دەکات بۆیە پێویستە ڕێگریەکەی بەهێزبێت.

5. **ڕاهاتن:**پێویستە پلانی بەرگری بەخێرای لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا بگونجێت کە لە مەیدانی جەنگدا ڕوئەدەن وە ڕاهاتنیش پێویستە دوو بار بگرێتەوە:

- گۆڕانکاری لە دەوروبەر و هەڵبەزو دابەزی ناوخۆیی.
- گۆڕانکاری لەبواری مەیدانیدا.

6. **پەیوەستی بە جێبەجێ کردن:** هێچ شوێنێك بۆ کاتبەسەربردن و یاریکردن نیە لە کاتی بەرگریدا.
7. **نهێنی پارێزی تەواو:** پێویست ناکات هەمو سەربازێك هەموشتێك بزانێت.
8. **واقعی بوون:**

- پێویست ناکات سەرکردە زیادە ڕەوی بکات لە نرخاندنی تواناکانی دوژمن.
- نا واقعی بون تەنها متمانەی سەرباز بە سەرکردایەتی ناروخێنێو بەس بەڵکوو نەمانی متمانەشیەتی تەنانەت بە خودی جەنگو کارابونی.

## ڕێگرەکانی پلانی بەرگری:

1. پەلەکردن لە جێبەجێکردندا.
2. پێویستی بە کەوتنەناو مەترسیو سەرکێشیە کە ئەبێتە هۆی پاشگەست بونەوەی هەندێ لەسەربازان.
3. کاری گەری دەرونی لەسەر بەرگریکار زیاترە و پێویستی بە ئارامگریو دان بەخۆداگرتنێکی زۆر هەیە وە هەروەها پەیوەستبونێکی تەواو.
4. لاوازی دابەشکردن(ژمارەی هێز).
5. لەدەستدانی سەربازانی ڕاهێنراو.
6. زۆری کەلێنەکانەکان.
7. کەمی زانیاری.
8. تێپەڕبونی کات و نەمانی پێداویستی و زەخیرە.

## نمونە لەسەرپلانی بەرگری لاوەکی:

1. **ئامانج:** قەڵا بەند کردنی بەشی ڕۆژهەڵاتی سەربازگەی ژمارە11
2. **ڕێگەی کار:** دروستکردنی هێڵێکی بەرگری توندوتۆڵی کەوانەیی کە سەربازانی دەوردەر بونیان هەبێت تیایدا.
3. **تێچون:** تاڕادەیەك بەرزە.
4. **توانا بەردەستیەکان:** دەستی کار هەڵکەنەر و پێویستیەکانی هەڵکەندن.
5. **کات:** بەپێی توانا.



## ئامێری داڕشتنی تۆڕی تونێلین:

دروستکردنی سێ بنکە لەژێر زەوی کە کۆمەڵێك تونێڵ پێکەوەیان ئەبەستێتەوە وە دروستکردنی تونێلەکان بە شێوەیەکی هونەری ورد و پێکەوە لکابن بەم جۆرە بۆ هەر تونێلێکی سەرەکی پێویستە چەند تونێلێکی لاوەکی هەبێت کە بەکاربهێنرێت بۆ جێ گۆڕکێی سەربازان و پێویستیەکان لە ژێر زەوی لە تونێلێکی سەرەکی بۆ تونێلێکی سەرەکی دیکە بەبێ ئەوەی چاودێری بکرێن لەلایەن دوژمن.

*هەندێك ناوچە هەیە كە هیچ تونێلێكی لاوەكی تیانیە بۆیە تۆڕێك لە كەناڵی قوڵی تیادا دروست ئەكرێت بۆ بەرگری كردن لە تاكەكان كە لەو شوێنەدا بونیان هەیە وە پاراستنیان لە هێرشی ئاسمانی وە هەروەها هێڵێكی پاراستنە لە بۆردومان و دارڕمان.

**یاسای (باشترین ستراتیژیات بۆ بەرگری هێرشبردنە):**

ئەم یاسایە جێبەجێ ئەكرێت بە زانینی ویستو خواستی دوژمن تاكو هێرشی بەرگری كاتی خۆی وەر بگرێت وە هێرشی بەرگری دو لایەن ئەگرێتەوە:

**یەكەم:** هێرشكردنە سەر دوژمن لەناو خاكەكەی پێشئەوەی ئەو دەست بكات بە هیرش.

**دووهەم:** هێرشی ڕاستەوخۆی غافڵگیر بۆ سەر دوژمن لەسەرەتای هێرشكردنیدا. بەلام ئەگەر هاتو دوژمن دەستی گرت بەسەر خاكەكەتدا ئەوا شتێك نیە بەناوی هێرشی بەرگری بەڵكو پێویستە دەری بكەیت لە خاكەكەت بە هێرشی ڕوخێنەر وە ئەمەش پێویستی بە كاتێ كی كەم نیە .

*ئەگەر زانیت دوژمن هێرش ئەكات ئەوا هیرش ببە پێشئەوەی هێرشت بكرێتەسەر وە گەر لاواز بویت ئەوا هێرش ببە لەگەڵ هێرشی دوژمن وە هیچ خاوە خاوێك نابێت هەبێت لەهەردوو بارەكەدا چونكە هەر ساتێك كەتۆ لەدەستی ئەدەیت دوژمن ئەیقۆزێتەوە ، وە هەر هەنگاوێك دوژمن دێتە پێش زیان بە ئەجێندا سەربازیو سیاسیەكانت ئەگەیەنێت ، وە كمینەكانت پێویستە بەپێی توانا دوربێت لە بنكەی سەرەكیت چونكە لەوانەیە زیان بە ستراتیژیەكانت بگەیەنێت لەبەرئەوەی كاتێ دوژمن دێتە نزیك بنكەكەت بەدڵنیاییەوە بۆچونی بونی كەمینی ئەبێت وەباش خۆی بۆئامادە دەكات تاكەشت كەنایزانێ شێوەی كەمینەكەیە.

# بەرگری شـــــارەکان

## پۆزێتڤی بەرگری کردن لە شارەکان:

1. شارەکان ئامادەن بۆ دابینکردنی هێڵی بەرگری بەشێوەیەکی باش بۆ بەرگریکار.
2. ئاسانی خۆ شاردنەوە و خۆپەنادان لە ناو باڵەخانەکاندا هەروەك چۆن بەربەستن لە بەر دەم تۆپهاوێژەکان.
3. ئەتوانرێت سود لە قاتەکانی ژێرەوەی باڵەخانەکان و ژێر زەمینەکان وەربگیرێت وەك پەناگەو حەشارگە بەکاربهێنرێن.
4. ئاسانی جوڵەکردن لەنێوان خانو باڵەخانەکاندا لەلایەن بەرگری کار.
5. ئەتوانرێت سود لە سەربانو ڕاڕەوە تەسکەکانی نێوان خانوەکان و تۆڕەکانی ئاوەڕۆ وەربگیرێت بۆ پێچدان لە دوژمن.
6. تەسکی شەقامەکان زرێ پۆشەکان لەکاردەخات.
7. **سروشتی جەنگ** لەناو شاردا ڕوبەڕو بونەوەیە لەنێوان پیادەدا بۆیە تا ڕادەیەکی زۆر لە کاریگەری ئاسمانیو تۆپ هاوێژ کەمدەکاتەوە.

## پێویستە ڕاستیەکانی شاربەمجۆرە بخرێنە ناو پلانەوە:

1. ئامانجە سەرەکیەکانی ناو شار کە دوژمن ئەیەوێت.
2. بەرە سەرەکیەکانی پێشڕەوی ، وە بەرە پێشبینی کراوەکان بۆ پێچدانو گەمارۆ.
3. وەبەر چاو گرتنی ناوچەکانی دابەزاندنی ئاسمانی کە لەوانەیە دوژمن سودی لێوەربگرێت بۆ دابەزاندنی هێز تیایدا.
4. وەبەر چاو گرتنی خاڵە باڵادەستو ڕوانەرەکان لەناو شاردا کە لەوانەیە دوژمن قەناص یان تۆپ هاوێژی تیا بڵاوبکاتەوە.

*چاودێری کردنی جوڵەی دوژمن و شێوازی بڵاوبونەوەی لە کارە گرینگەکانە لە بەرگری ناو شارەکان.

*سود وەرگرتن لە تەواوی هۆکارەکان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری **(هۆکارەکانی ڕاگەیاندن- گوێ گری-چاودێری)**

*لە ڕێگەی زانیاری بەتەکتیکی بەکارهاتو و ستراتیژیەتی دوژمن لە شەڕەکانی پێشویدا و دەرهێنانی ناوەڕۆك وە پاشان دانانی سیناریۆ چاوەڕوانکراوەکان لەسەر شێوەی دابەشبونی دوژمن و شێوازی هێرشکردنی وە ئەو ڕێگایانەی کە دەیگرێتەبەر.

*پێویستە چاودێری بەردەوام هەبێت بەشێوەیەکی وردو خێرا وە لەسەر شێوەی دەوریەو کمین و تێ هەڵکوتان.

**بڵاوبونەوەی گروپەکان:** پێویستە بڵاوبونەوە سەرەتا لە خاڵە ڕوانەرەکانو بەرزاییەکانی ناو شاردا دەست پێبکات بەجۆرێك پەیوەندی بەردەوام لەنێوان گروپەکاندا هەبێت.

**دابینکردنی سەرکردایەتی و باڵا دەستی:** سەختی بەڕێوەبردن و باڵادەستی لە گروپە جەنگاوەریە بچوکەکانەوە دەستپێئەکات ، وە کەم کارایی پەیوەندی بێتەل لەناو شاردا لەم سەختیە زیاددەکات وە هەروەها سەختی دانانی وێنەیەکی گشتگیر و ورد بۆ پێشهاتە جەنگیەکان بەهۆی سنورداری چاودێری ، وە بۆ تێپەڕاندنی ئەم سەختیانەش ، سەرکردە پشتدەبەستێت بە فراوانترکردنی پەیوەندیە یەدەگەکان **(نێردراوەکان- ئامێرەکان -ئاماژە-پەیوەندیە بێتەلەکان).**

**دەست پێشخەری کردن بە شکاندنی ئاگری دوژمن:**
بەجۆرێك کاردەکرێت لەسەر شکاندنی ئاگری دوژمن بەشێوەیەکی بەردەوام ، بەواتای نەدانی بوار بەدوژمن کە تەقە بەشێوەیەکی ورد بکات ، چونکە گەر وانەکەین لەم بوارەدا ئەکەوینە باری بەرگری نەگەتیڤەوە ، وە کارەکەمان کورت ئەبێتەوە لە

کاردانەوەدا وە دەست پێشخەری دەکەوێتە دەستی دوژمن وە لێرەشدا زیانەکان چەندئەوەندە ئەبن ، بەڵام لەکاتێکا کە ئێمە دەست پێشخەری ئەکەین ئەوا پێچەوانە دەبێتەوە وە کاری دوژمن تەنها دەبێتە کاردانەوە.

## دەستگرتن بــە هێزەوەو بەفیڕۆنەدانی:

وە ئەمەش بەفیڕۆنەدانی خۆراکو زەخیرە دەگرێتەوە وە هێشتنەوەی بەشی هێرشی هەڵگەڕاوە و بەرگری دوای هێرشی هەڵگەڕاوە.

*گرنگترین هەنگاو لە بەرگری شاردا وە پایەی بنچینەی لە پلانی بەرگری شار بریتیە لە بڕیاردانی دروست و دامەزراو لەسەر بنچینە سەربازیەکان نەك هەستو سۆز.

## ڕوبەری بەرگری دەرەکــی:

ئامادەکاریو ڕێکخستن لەسەر ڕێگەکانی کەدەگاتە شار ، وە لە ڕێکخستنیا سروشتی زەویەکەو قەبارەی هێزی بەرگری و تواناکانی بەرچاودەگیرێت، هەروەها قەبارەی هێزی هێرشبەر و تواناکانی و باڵادەستیەکانی لە(**تۆپ هاوێژ-فڕۆکە.......هتد**) وە توانایەی بەرگری زیاتر و سەرەکیتر دەخرێتە سەر ڕوبەری دەرەکی شار و تێکشکاندنی هێزی دوژمن پێش گەشتنی بە شار و لەکاتی نزیکبونەوەیدا ، لەگەڵ تایبەتکردنی هێزی کەمتر بۆ بەرگری لە ناو شاردا بەڵام ئەگەر زەوی نەیهێشت بەرگری بکەیت لە ڕوبەری دەرەکی ئەوا پێویستە دیدگەی توانای سەرەکی بەرگری لە ڕوبەری ناوەکیدا دابنرێت لەگەڵ دەستگرتن بەسەر خاڵە دەرەکیەکان بەهێزێکی کەمتر.

## ڕوبەری بەرگری نـــاوەکـــی:

ناوەوەی شار ڕێك ئەخرێت و ئامادەکاری تیا ئەنجام ئەدرێت ، وە لە ڕێکخستنیدا سروشتی زەویەکەی و قەبارەی هێزوی بەرگری و تواناکانی بەرچاو ئەگیرێت هەروەها لەگەڵ توانای دوژمن و قەبارەی هێزەکەیان و توانا چەکیەکانی هێزی هێرشبەر(تۆپهاوێژ - فڕۆکە.....هتد) وە بەراورد ئەکرێت بەم جۆرەی خوارەوە:

1. دابەشکردنی شار بۆ پارچەی بنکەیی ، ئەمەش بۆ ئاسانکردنی دەست بەسەراگرتنی تەواوی شار و نەهێشتنەوەی هیچ کەلێنێك کە دوژمن بیقۆزێتەوە بۆئەوەی هێڵە بەرگریەکانمان ببڕێت ، وە ئەتوانین ناوچەکان دابەشبکەین بەپێی سروشتی شارەکە ، وە ئەمەش بەپێی زانینی سروشتی جوگرافی شار دەبێت ، وەك هەندێ شار دابەشبون بەهۆی بونی ناوچەی کشتوکاڵی و دارستانی دەستکرد تیایدا یان بونی ڕێگە سەرەکی پان کە گەڕەکەکان لێك جیادەکاتەوە یان لەوانەیە ڕوبارێك شار بەش بکات یان شاخێك.
2. دابەشکردنی ناوچەکان بۆ چەند ناوچەیەکی بچوك ئەمەش بۆ دابەشکردنی گروپەکان بەسەر ئەو دابەشکردنەدا.
3. دابەشکردنی گروپەکان پێویستە بەپێی قەبارەی شارو قەبارەی هێزبێت.
4. دامەزراندنی سەرکردایەتی بۆ هەمو ناوچەکان وە پێویستە لە پەیوەندیابێت لەگەڵ سەرکردایەتی شاردا **(ژوری کردەوەکاری).**
5. دروستکردنی لیژنەی بەرگری نەتەوەیی وە سودوەرگرتن لێیان بۆ چاودێری ڕەسەد گرتن و گواستنەوەی زانیاری و خزمەتگوزاری.
6. دابینکردنی خزمەتی لۆجستی وە هەمو ناوچەکان پێویستە **(خواردن-خواردن- زەخیرە-فریاکەوتنی سەرەتایی)** تەواوو پێویستیان هەبێت.
7. دابەشکردنی گروپەکان لەناوشاردا بەشێوەیەکی تەواو ، نابێت دابەشکردن تەنها لەدەرچکاندا کورت ببێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە پێویستە دەرچەکان بەهێزتربن وە هەروەها پێویستە دابەشکردن لەشاردا بەپێی سروشتی ڕێگەکانی

و گەڕەکو ئەو دەرچانەی کەلەوانەیە دوژمن لێوەی بێتە ناوەوە ، بەجۆرێك لەم دابەشکردنە ئەم شتانەی لای خوارەوەمان دەست بکەوێت.

- هەر گروپێکی بچوك هەر خۆی گروپی بەرچاو گیری و پاسەوانی و بەرگری و پاراستنە بۆ گروپە هاوسێکەی وەك ئەم شێوەیەی لای خوارەوە ، وە جێبەجێ کردنی بنەمای بڵاو بونەوە بۆ کەمکردنەوەی زیانەکانی بۆردومان.



- نەزانراو بێت بۆ ڕێگرتن لە پێچدانی دوژمن یان دابەزینی ئاسمانی.
- بوار بدات بەگروپێك زیاتر کە مامەڵە لەگەڵ دوژمنی پێشڕەوی کاردا بکات لە باری ئقتیحامدا.
- گروپەکان هەندێکیان وەك پاڵپشت کار ئەکەن بۆ هەندێکی تریان.

## مەبــەست لە دابەشبەکردنی گروپــەکان:

- ئاسانی دەستگرتن بەسەر جوڵەی تاکەکانی گروپ.
- چەندێك ژمارەی تاکەکانی گروپ کەمتربێت ئەوەندە ئاسانتر بەڕێوە ئەبرێن و ئاڕاستە ئەکرێن.
- ئاسانی کردەوەی پێشڕەوی کردن(شاردنەوە-پێشڕەوی-پاشەکشە-جوڵە-دزەکردن).
- کەمکردنەوەی زیانەکان بەپێی توانا لەباری بۆردومان کردنی ناوچەیەك لەناوچەکان بۆنمونە زیانی دروستبوو لە بۆردومانی ناوچەیەك کە گروپێکی

تیایە لە 3 کەس پێکهاتووە بەهیچ شیوەیەك وەکو ئەو گروپەنیە بۆردومان کرابێتو ژمارەی سەربازەکانی10 یان زیاتر بێت.

*مەرجە لە دابەشکردنی گروپەکاندا پەیوەندیان لەنێواندا هەبێت لەگەڵپاراستنی بڵاوبونەوە بەجۆرێك ئەمەی لای خوارەوە جێبەجێ ببێت:

1. هیچ پچرانێك لەنێوان گروپەکاندا نەبیت بەجۆرێك کەلێن دروست ببێت لە بەرگریداو باڵا دەستی نەمێنیت ، پێویستە وەك زنجیر پێکەوە بەسترابن .
2. پارێزگاری بکەن لە بنەمای بڵاو بونەوە بۆ کەمکردنەوەی زیانەکان کە لە بۆردومانەوە دروست ئەبێت ئەمەش بەپێی سروشتی شارەکەو رێگەو بانو سروشتی باڵە خانەکانو چۆنیەتی دامەزراندنیان.
3. پێویستە گروپەکان باڵادەستبن بەسەر ئەو راڕەوانەی کە دەگەن بەناوچەی دانیشتوان.
4. هەر بنکەیەکی بەرگری لە باڵەخانەیەك یان زیاتر پێکدیت کە پیکەوە نوسابن بە هۆی چەند خەندەقێکەوە.
5. هەر پۆلێك لە باڵەخانەکان دابەش ئەکرێن بۆ چەند چوار گۆشەیەکی بەرگری بەجۆرێك سنوری چوارگۆشەکان دەوربەر یان نزیکی رێگە گرنگەکانبێت.

## خــۆ پاراستن لە گەمارۆ:

پێویستە بەرگریکار رێ نەدات بە گەمارۆدرانی وە یاسای جێگیر تیایدا ئەوەیە رێنەدەیت بەدوژمن یان نەچیتە ناو ئەو شەڕانەوە کە دوژمن کاتو شوێنەکەی دیاری ئەکات وە گەر هاتو توشی گەمارۆ هاتی پێویستە ئەم رێنمونیانە ئاگاداربیت.

### ئەگەرگەمارۆ بە شەوبوو:

- پێویستە لەسەر تاکی سەرباز کە بەردەوام چاوەدێری چواردەوری بکات هەتاکو دوژمن ئاشکرا بکات پێش گەمارۆدان و لێکدانی بازنەکە ، وە پاشان پاشکشە بکات بۆ ناوچە ئاسایشەکان بێ ئەوەی دوژمن ئاگاداربێت.

- بەهیچ شێوەیەك نابێت هیچ جۆرێك لە جۆرەكانی ڕوناكی بەكاربهێنرێت لە كاتەكانی تاریكیدا.
- پێویستە لەكاتی گەمارۆ درانی بازنەیدا بگەڕێیت بۆ لاوازترین خاڵ لە بازنەكەدا وە بزانیت كەی ئاڵوگۆڕی پاسەوانیەكان ئەكرێت لەو جێگەیەو لەو كاتە پێویستە بازنەكە بشكێنرێت یان كەلێنێ بدۆزرێتەوە لەناو بازنەكەداو پاشەكشەی لێوە بكرێت گەر پێویستبێت پاشەكشە بكرێت.
- ڕۆشتن لەو شوێنەوە كە ئامێرو ئۆتۆمبێلەكانی لێوە ئەڕوات و ڕاستەوخۆ دوای تێپەڕینی ئامێرەكە تێپەڕبون چونكە لەو كاتەدا دوژمن سەرنجی بەهۆی گڵۆپی ئۆتۆمبێلەكەوە ڕاكێشراوە ناتوانێت تەركیز بخاتە سەر بەشەكانیتری ناوچەكە وە هەروەها دەنگی ئامێرەكەش یارمەتی شاردنەوەی دەنگی قاچو هەناسە و تەقە تەق ئەدات.
- سود وەرگرتن لە سەرقاڵی دوژمن لە بارێكدا گروپێك هەڵدەستێت بە ئەجامدانی تەقەو تێك ڕژان لە جێگەیەك وە لە جێگەیەكی ترەوە گروپێكیتر هەڵدەستێت بە پاشەكشێ.
- ئەتوانرێت سەرنجی دوژمن ڕابكێشرێت بەداگیرساندنی بلاجكتۆرێكی گەورە بەرەو ڕویان و پاشان پاشەكشە بكرێت.

*بزانە ئەگەر دوژمن ڕوناكی لەدەوری خۆی كوژاندەوە ئەوا پشت ئەبەستێت بە دوربینی شەو.

**ئەگەرگـەمارۆ بەڕۆژبــوو:**

پێویستە نەخشەیەكی تەواو گشتگیر دابڕێژرێت بۆ ڕوبەڕو بونەوەی دوژمن و دانانی جێگەكانی بەیەكگەشتن و مامەڵە كردن لەگەڵ هەر هەوڵكی پێشڕەوی دوژمن هەروەها دانانی نەخشەی پاسەوانی و نەخشەی پاشەكشێ هەرچەندە پاشەكشە لەڕۆژدا لە هەڵە گەورەكانە لەزۆر كاتدا بەتایبەت بۆ هێزێك كە خاوەنی چەكی ئاسمانی و زرێ پۆشی بەهێزو دور هاوێژە ی بەهێز نەبێت.

**بەکورتی**: باشترین کارێك بۆ خۆ پاراستن لە گەمارۆ ئەوەیە کە تەواوی هەوڵ بدەیت نەکەویتە گەمارۆوە وە هیچ ڕێگە نەدەیت بەدوژمن کە چواردەورت بگرێت وە پێویستە دەستپێشخەری بکەین لە هەڵکەوتنی هەلی پاشەکشێ و چاوەڕوان نەکەین چونکە هەر خولەکێك چاوەڕوانی ، دوژمن ئەیقۆزێتەوە بۆ پێ جێگیرکردن و باڵادەستکردنی زیاترو توندکردنی گەمارۆکە ، لەکاتیکدا هیوایەکت بە بەرەکانی تر نیە کە گەمارۆ بشکێنن لە دەرەوە وە مەبەستیش لێرەدا ئەوەیە کەباشترین کارێك کەدەبێت بیکەیت ئەوەیە کە هێرشی هەڵگەڕاوە بکەیتە سەر دوژمن بۆ شکاندنی گەمارۆ.

**والسلام عليكم ورحمة الله**

2/10/2017